باریکاریا جامعا بەغـدا هاتیە چاپکرن

# آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی

# Awa u Destura zimane KURDI

جـگر خوین

CEGER XWIN

بە رەزامەندی رەقابە چابکراوە

بەغـدا - ١٩٦١

# فهرەست

| روپەل | | مادة |
|---|---|---|
| ١ | آخافتن | ( كلام ) |
| ٢ | پەیڤ | ( جملة ) |
| ٣ | دەستپێکراو | ( المبتدأ ) |
| ٦ | سالوخ | ( الخبر ) |
| ٧ | خوەپێگر | ( المتعلق ) |
| ١٠ | گۆتن | ( الكلمة ) |
| ١١ | كارت | ( المقطع ) |
| ١٣ | ناڤ | ( الاسم ) |
| ١٣ | تەکناڤ | ( الاسم الخاص ) |
| ١٤ | بێش ناڤ | ( اسم الجنس ) |
| ١٥ | سادە ناڤ | ( الاسم البسيط ) |
| ١٥ | پارچیم ناڤ | ( اسم المركب ) |
| ١٧ | کوم ناڤ | ( جمع الاسم ) |
| ٢٠ | دەمناڤ | ( اسم الزمان ) |
| ٢١ | جي ناڤ | ( اسم المكان ) |
| ٢٣ | آلاڤناڤ | ( اسم اللالة ) |
| ٢٤ | بچوکناڤ | ( اسم المصغر ) |
| ٢٥ | نێرو مێ | ( المذكر والموءنث ) |
| ٢٩ | پەسنو پەسندراو | ( الصفة والموصوف ) |
| ٣٠ | پالڤدارو پالڤدێر | ( المضاف والمضاف اليه ) |
| ٣٢ | ژمار ناڤ | ( العدد ) |
| ٣٥ | ژێدەر ناڤ | ( المصدر ) |

| روپەل | | مادة |
| --- | --- | --- |
| ٤١ | ـ كرۆكناڤ | ( اسم الفاعل ) |
| ٥٠ | ـ پێكراو ناڤ | ( اسم المفعول ) |
| ٥٢ | ـ ركناڤ | ( الاسماء المتضادة ) |
| ٥٣ | ـ جيوى ناڤ | ( الاسماء المترادفة ) |
| ٥٣ | ـ ژبەر ناڤ | ( البدل ) |
| ٥٤ | ـ ڤەبژار | ( التميز ) |
| ٥٥ | ـ ناڤ دەنگ | ( الشهرة ) |
| ٥٥ | ـ رەوش | ( حال ) |
| ٥٦ | ـ بالڤدان | ( النسبة ) |
| ٥٧ | ـ ناڤێ نيشاندان ـ | ( اسماء الاشارة ) |
| ٦٢ | ـ پرسيارى | ( الاستفهام ) |
| ٦٥ | ـ بێتر ناڤ | ( افعل التفضيل ) |
| ٦٧ | ـ ناڤێ ديتىو نەديتى | ( المادى والمعنوى ) |
| ٦٨ | ـ دەڤ خوارى | ( الايمالة ) |
| ٦٩ | ـ پەرگالا ناڤ | ( وضع الاسم ) |
| ٧١ | ـ بەرناڤ | ( الضمائر ) |
| ٧٤ | ـ پەرگالا بەرناڤ | ( وضع الضمائر ) |
| ٧٥ | ـ بەرناڤو نيشان | ( الضمائر والعلامة ) |
| ٨١ | ـ بەرناڤێ پاشگر | ( الضمائر اللاحقة ) |
| ٨٢ | ـ بەرناڤو نيشاندان | ( الضمائر واسماء الاشارة ) |
| ٨٤ | ـ بەرناڤێ نەناس | ( الضمائر المبهمة ) |
| ٨٥ | ـ ئێو ( آ ) | ( ... ) |
| ٨٦ | ـ بانكراو | ( المنادى ) |
| ٨٧ | ـ آلاڤ | ( الاداة ) |

| مادة | ڕوپەل |
|---|---|
| ( اداة النداء ) | ٨٨ ــ ئالاڤێ بانگێ |
| ( نداء بدون اداة ) | ٩٢ ــ بانگا بێ ئالاڤ |
| (اداة التذوق والتأوه) | ٩٣ ــ ئالاڤێ خوەش‌و نەخوەشي |
| ( اداة التمنى والترجى ) | ٩٥ ــ ئالاڤێ خوەزی‌وهێڤی |
| ( التعجب ) | ٩٧ ــ ئالاڤێ تعجب |
| ( التشكيك ) | ٩٨ ــ .. گومان |
| ( اداة الشرط ) | ٩٩ ــ ئالاڤێ مەربەند |
| ( اداة الحصر ) | ١٠١ ــ ئالاڤێ گشتی |
| ( اداة الاجلية ) | ١٠٣ ــ ئالاڤێ سەبونی |
| ... | ١٠٥ ــ ئالاڤێ ئاواي |
| ( اداة التشبيه ) | ١٠٧ ــ ئالاڤێ وەکی |
| ( اداة التجريض ) | ١٠٧ ــ ئالاڤێ ناڤتێدان |
| ( اداة التنبيه ) | ١٠٩ ــ ئالاڤێ ئاگاهداری |
| ( اداة التحقيق ) | ١٩٠ ــ ئالاڤێ تەقەزە |
| ( اداة غير معينة ) | ١١٠ ــ ئالاڤێ يان يانە |
| ( اداة النفى ) | ١١١ ــ ئالاڤێ نەبونی |
| ( اداة للنهاية ) | ١١٣ ــ ئالاڤێ داوی |
| ( اداة التحسين ) | ١١٤ ــ ئالاڤێ خوەشکرن |
| ( اداة للزمان والمكان ) | ١١٥ ــ ئالاڤێ دەمدار |
| ( اداة بمعنى ( مع ) | ١١٦ ــ ئالاڤێ گەل |
| ( اداة المعرفة ) | ١١٩ ــ ئالاڤێ دانزانين |
| ( اداة المبالغة ) | ١١٩ ئالاڤێ فۆرت |
| ( اداة التصغير ) | ١٢١ ــ ئالاڤێ بچوکی |
| ( اداة التأكيد ) | ١٢١ ــ ئالاڤێ راستی |

# راستکرن

| روپەل | خێز | چەوت | راست |
|---|---|---|---|
| ١٤ | ١٢ | پێشەك | یێشەك ٣ |
| ١٧ | ٥ | سورایت | سوارێت |
| ٢٠ | ٩ | ناڤ | ناڤە |
| ٢١ | ٥ | شگەڤت | شکەفت |
| ٢٢ | ٥ | تلۆر | تلور |
| ٢٥ | ٧ | دادە | دوادە |
| ٢٨ | ١٩ | ومها رەنگە | وها رەنگە |
| ٣٠ | ١ | پسنێ | پەسنێ |
| ٣٣ | ١٢ | ڤەبژێ | ڤەبژێر |
| ٣٨ | ١٢ | نا | یا |
| ٣٨ | ٥ | لێێش | لپێش |
| ٤٧ | ٢٠ | تەیار | نەیار |
| ٤٨ | ١ | گوتیە | گۆتیە |
| ٤٩ | ٥ | ئی — ئێ کۆ | ئێ — ئێ کۆ |
| ٥٥ | ٩ | سەمیرو ، باڤ | سەیرۆ ، باڤێ |
| ٦٢ | ٥ | خورێتا | خورتیا |
| ٦٤ | ١٣ | تەڤابي | تەڤایی |
| ٨٠ | ١٥ | چوا | چاوا |
| ٨٥ | ٣ | هەوها | هەروها |
| ٨٥ | ٨ | دي | دبێ : |
| ٩٢ | ٢ | ددوايدە | دداويدە |
| ٩٣ | ١٤ | من ختیە | من نە ختیە |

| راست | چەوت | خێز | روپەر |
| --- | --- | --- | --- |
| ئۆخوەش | ئوخوەش | ٧ | ٩٤ |
| بەرانەکی | برانەکی | ١٣ | ١٠٧ |
| دگەلی رە | دگلیدە | ٨ | ١٠٩ |
| سبەینێ | سەبینێ | ٤ | ١١٠ |
| تۆشێ | وش | ١٣ | ١١١ |
| گەلیێ | گليي | ٢٠ | ١١٣ |
| کەڤەژە | کەڤەرە | ٢ | ١١٩ |
| ئو | ئۆ | ٨ | ١٢٦ |
| وێ | وی | ١٨ | ١٤٣ |
| آڤیتنا | آڤتنا | ١٨ | ١٦٢ |
| من آڤ (آڤنەخواریە) زێدەیە | | ١١ | ١٦٥ |
| هەروەکو | هەوەکو | ١١ | ١٧٩ |
| بدێ | بدی | ١٨ | ١٧٩ |
| ( ئی ) | ( ئێ ) | ٢١ | ١٨٩ |

( ٧ ) ـ ئەڤ دروڤ ژبەرکۆ دچاپێدە کێم هەبو گەلەك جاران لسەر جهێ خوە نەهاتیە دانین آگاهداربن •

# بەرنامە ـ (دیباجە)

بێگومانە کۆ زمان د آقاني‌و هەبونو سەرخوەبونا ملەتەکی‌دە یەك ژ چار دیوارێ مەزن و بنگەهي‌یە• زمانزانێ جهان هەمو وەکە مە باوەر دکن و دبێژن : ـ کۆ زمان دڤێ مەیدانێ دە ژهەڤالێ خوە نەکێم ترە •

چاوا کۆ ملەت بێ یەکیتی‌یا آبوری‌و جغرافی‌و رەوشا تاریخی : ـ خوندەواری ـ باوەری ••• نکاری هەبونو سزابونا خوە ژبو سەرخوە بونو آزادی‌یا وەلاتێ خوە بدی خویا کرن ، ولۆژی یەکیتی‌یا زمان بەهەرسێ دیوارێن مایێ‌رە هەمپارو خوەدەي پشکە •

: ـ پەرچەبون ـ یا پەرچەکرنا زمانا زیانەکە مەزنو دژوارە ژبۆیەکیتی‌یاملەتا • ئەو ملەتێ‌کۆ زمانێ وي‌نەیەك‌بي بدژواری دکاری خوە بگهینی رێزا ملەتا • گەر چە زمان نەهەر تشتە ژبۆ پاراستنا ملەتا ، لێ بێگومانە کۆ تشتەکی هێژآو برومتە •

ـ زمانێ کوردي دمەیدانا شەرێ زمانا دە ئەڤ چەند هەزار سالە کۆ بمێر آنی‌و گەرناسي لبەر خوە ددی ، گلك کوزکو چەپەرێن خوە ژدەستی خوە بەرنەدانە و ژ آلیکي دی ڤە هن ایریشێن خورت و دژوار دبي سەرکۆزك‌و چەپەرێن دژمن • گلك گۆتن‌و داخوازێن هێژاو برومەت دناڤ خوە دە پشافتنە • لێ بێگومانە کۆ دژمن هن کۆزك‌و چەپەرێن هێژاو برومەت ژدەستێ وی بزۆر دەرخستنە • لێ باوەرم کۆ ژایرۆو پاش دە زمانێ‌مە وێ‌هن گاڤێن بێ پێڤان‌و فرەه برومەت ب پێش دە باڤێژي • بڤی آواي وێ تێزیك خوە ژ پێلێ دەریا بن دەستي بپارێزي‌و خوە بمێرانی بگهێني دەلاڤێ آزادي‌و سەربەستي‌یێ

: ـ گلك‌تڤیارو تڤشت دبوارا آواو دەستورا زمانێ‌کوردی‌دە

هاتنه چێکرنو بەلاڤکرنو خوەدیێ ڤانڤشتو نڤیسارا گەلەك ژوان دڤێ بابەتی دە خوارنه و خەباتا وان گەلەك گرانبها لسەروان هاتیه ، هندەك ئەوە کو هنەك ژ ژینداریا خوە بنەخوەشیو هەژاری رابواردنه • لێ هەر چاوابي کارێ وان جامێرا درو پەلی تاریخا ملەتێ مه دە وێ جیکي بلندو پایەدار بستێنی • ناڤێ‌وا دناڤ فهرەستا ناڤێ گەرناسێ ملەتێ مه دە وێ بزیراڤ بێنه نڤیسین • تۆرنو نەڤیێن ملەتێ کورد دچاخو دەمێ هێتێ دە وێ‌لسەر ریزانیو لبەر رۆناهیا تەڤگەرو خەباتا وان برێ کەڤن •

: ــ خوەندەوارێ برومەت ! ئڤیسینا ڤێ نڤشتێ نه ژبۆ خوەندنا خوەندەگەهایه، لێ ژبۆ آلیکاریا خوەندەوارێ‌زاناو سەیدایێ هێژایه• گەر چه ئەڤ نڤشتا مه ژ کێما سییا نه پاراستی‌یه لێ گەلەك تشتی هێژا ونێ تێدە بێنن •

: ــ براستی ئەڤ نه خەباتا چەند سالێ نێزیکه لێ خەباتا ( ۲۰ ) سالایه کو ژبەر هن کارێ دی کو بمەڤه هاتبون گرێدان مەنکاربو بپێشدە بین وچاپ بکن • هێژی ئەم نه باوەرن کو بڤێ نڤشتێ ئەم گهانه داویا داخوازا خوە • ژبەرکو دایرۆ دە ئەم چه بنڤیسن تکارن بگهێن داویێ • پەریشانیو دەمو چاخێ دژوار دەستیمە گرێدای هشتنه • لێ هەر نەبي ئەم ڤي کارێ گران ژملەتێ خوەرەبێ‌هەبەرو برومەت تشتەکی بچوكو هندەك دبینن •

: ــ دگەل کیماسیێ ڤێ نڤشتێ باوەرم کو وەکه گاڤا پێشییه د یەکیتیا زمانێ کوردی دە ، یان کەڤرێ بنگەهی‌یه د لێکرنا دیوارێ یەکيتييا زمانێ مەدە • لسەر ڤی آوای خوەندەوارێ جوانو سەیدایێ زانا دکارن بهەسانی گاڤێن خوە سڤكو فرەه باڤێژن •

: ــ بێگومانه‌کوزانین وخوەندنا هەردو شیوەێ زمانێ کوردی تەنێ دکاری ڤێ رێ ژمەره هەسانی بکی ، من گەلەك دخوەست کو

هشارتي ێ شیوەێ سۆری بزانم ، لێ پرجهێ آخینه کۆتاایستا ئەگامه نیڤێ رێ •

:ـ ژلەورا هێڤی دکم ئەگەر هن کیماسي دتشتا مه دەهەبن ژیەر ڤي آوايي‌یه ، خەسما دشیوەێ سۆری‌ده من نکاربو کورودور پێ‌دەمەرم •

:ـ چاوا دزانم کیمایێ ڤێ تشتێ ئەڤن :

١ ـ بشیوەێ سۆری باش نزانم

٢ ـ ب تیپێ عەرەبي هاتیه ڤیسین

٣ ـ هن تیپ‌و دروف دچاپێ‌ده نەبون •

٤ ـ پەره د دەستێ مه ده کیم‌بون •••

:ـ خـوەندەوارێ هێژا ! مه ژوەره ژل‌گۆرا زانینا خـوە نەوەکهڤیێ کۆ دناف‌بەرا شیوەێ سۆری‌و کورمانجی‌ده هەنه دانه خویاکرن ، کوروهور لێ‌تەماشابکه و پاشێ چه ژێ کیمه راست‌بکه، هن گاڤێن هێژا دڤێ بابەتێ ده بپێش‌ده باڤێژه •

:ـ چه تشتێ کۆ جارا پێشي چێ‌دبي بجارەك ژ کیماسي‌یانێ پاراستن • بەرەبەره هەرتشت ـ هەرکار بپێش ڤه دچي •

## :ـ نەوەکهڤی دناف بەرا هەردو شیواده :

١ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ بەرناڤا •

٢ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ کرنا نەپەندی •

٣ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ پێشگرو پاشگر ( اللاحقة )

٤ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ آلاڤا د هەردو شیواده

٥ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ ڤیساندن •••

٦ ـ نەوەکهڤي‌یا ـ تیپێ ڤیساندن •••

٧ ـ کیماسي‌یا سێ تیپێ کوردی دشیوەێ سۆری‌ده •

٨ ــ نەبونا ێرو مێ دشیوەێ سۆرێدە •
٩ ــ دەڤ خواری د هەردو شیوادە •
١٠ ــ قەلەوي دهەردو شیوادە •
١١ ــ پەیدابونا هن گۆتنێ بێگانە دهەردو شیوادە •
١٢ ــ چێکرنا هن زاراڤ دهەردو شیوادە •
: ــ ل گۆرا زانینا من بڤان آواێ ژۆری هەردو شیوە ژهەڤ دور بونە •

: ــ جا ئەگەر ئەم کاربن ڤا نەوەکهڤيیا ژناڤبەرا هەردو شیوا راکن ، زمانەکي یەك شیوە ژ بۆ ڤیینێ دکوردستانێدە لدار دکەڤي

## ( ١ ) ــ نەوەکهڤيیا بەرناڤا •

چاوا هاتە زانین بەرناڤ د شیوەێ کورمانجی دە دو پەرچەنە :
١ ــ یەکەم دکرنا تێپەرا بۆرێدە
٢ ــ دوەم دهەمو کرنێ ماي دە •
: ــ دکــرنا تێپــەرا بۆرێدە : ( من ، تە ، وی ، وێ ، مە ، وە ، وا )
: ــ دکرنێ ماي دە : ( ئەز ، تو ، ئەو ، ئەم ، ون )
: ــ نیشانێ پاشگر : ( م ، ئی ، ن ) •

## : ــ لێ دسۆرانیدە :

ــ بەرناڤێ پێشگر : ( ئەمن ، ئەتۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە، ئەوان )
ــ بەرناڤێ پاشگر : ( م ، یت ، ئی ، مان ، تان ، یان ) •
: ــ ئەوژی گلك جارا تێنە گۆراندن •
( ٣ ) تیپ زێدە دبن ، دەما بێژن : ــ نانمان خوارد •

( ٦ ) تیپ زێده دبن ، دەما بلێن : ــ ئێمه نانمان خوارد •
: ــ گەر چە د تەڤگەرێ خوه دە :ــنانمانخواردــمەنانخوارد•
وەکە هەڤ تێن ، لێ زێدەبونا ( ٣ ) تیپانە هندکه • بهندکاي ئەڤەکۆ
شیڤان گەرەکە ( ٣ ) جارا ( قەلەما ) خوه خوه بگەرێني • ودەستێ
خوه بوەستێني • وژچاخێ خوه هنەکی بادێ هەوا دەرباسکی •
: ــ دهەمو زمانێ دنیایێدە سڤکاي داخوازەکە تاریخیيە • هەر
مرۆڤ بپێشڤە هەری گەرەکە زمانژی هنگاوەکێ بپیشدەباڤێژی•

## ( ٢ ) ــ نەوەکهڤیيا کرنا نەپەندی :

چاوا هاتە زانین : ( رێ ، را ) دو آلاڤن کرنا نەپەندی دشیوەێ
سۆرییدە چێدکن • ( بارام کوژرا ــ بارام ئەکوژرێ )
: ــ ( هات ، تێ ، بێ ) سێ آلاڤن دشیوەی کورمانجیدە کرنا
نەپەندی چێدکن : ــ بارام هات کوشتن ــ بارام تێ کوشتن ــ بارام
دێ بێ کوشتن • ئەڤ نەوەکهڤی دزمانێ ( عربي ) دە ژی هەیە :
( قتل ــ صار قتیلا ) • دشیوەێ سۆری دە ( کوژرا ــ قتل ) •
دشیوەێ کورمانجی دە : ( هات کوشتن ــ صار قتیلا ) • دڤردە
شیوەێ سۆری پێتر خوەشو راستە •
ــ گەرەکە هەردوژی بێنە نڤیسین ، لێ بآوایێ سۆری راستە
گەرەکە ئەم بدەستێ خوه بگرن •

## ( ٣ ) ــ نەوەکهڤی دپێشگرو پاشگردە :

هەروەکو هاتە زانین ژێدەرێ سۆریو کورمانجی دڤیبابەتێدە
سەروبنێ هەڤ دبن •
سۆری : ــ گەرانەوە ــ خواردنەوە ••• •
کورمانجی : ــ ڤەگراندن ــ ڤەخوارن •••

## ( ٤ ) ـ نەوەكهڤىیا آلاڤا :

: ـ هن آلاڤ هەنە كۆ دسۆرانیدە هەنە لی دكـورمانجیدە پەیدا نابن • چاوا كۆ هن آلاڤ دكورمانجی دەهنە كو دسۆرانیدە پەیدا نابن • لێ ئەڤ هەسانی یە • ئەم دكارن تەڤا بهڤرە كۆم بكن •

## ( ٥ ) ـ: نەوەكهڤىیا نڤیساندنێ دهەدو شیوادە :

بێگۆمانە كۆ كورد بـچەند نفشا دڤیسن :

١ ـ لـایرانو عراق بتیپێ عربي •

٢ ـ ل ئەرمینیا بتیپێ روسی •

٣ ـ لـسوریا وتركیا بتیپێ لاتیني •

: ـ چاوا كۆ آوایێ نڤیسینێ نەوەكهڤە •لێ ئەڤ هەمو هـانيیە

## ( ٦ ) ـ كیماسیـیا سێ تیپێ كوردی :

٣ـ سێ تیپێ كوردی دشیوەیێ سۆراني دە كێمـن ( ژ ، ڤ ، أ )

: ـ بێگۆمانە كۆ ئەڤ سێ تیپ ژ كۆكا زمانێ كوردن •

: ـ ئەڤ ژی هـانيیە •

## ( ٧ ) ـ نەبونا (نێرو مێ ) دشیوەیێ سۆری دە :

دهەمو زمانێ ( آری ) دە ژ فارسي پێڤە نێرو مێ هـەنە • لێ دفارسي دە خویا یە كۆ دبن بارێ زمانێ بێگانە دە رەوشا زمانێ خوە وند اكریە •

## ( ٨ ) ـ دڤ خواری : ( ایماله )

دهەردو شـــیوادە ئەڤ دەڤ خواري پەیدا دبي • لێ ئـەڤ بـخوەندنو زانینا شیوا تێ راكرن •

## ( ٩ ) ـ قەلەوی دهەردو شیوادە :

ئەڤ ژی وەکە دەڤ خواری بخوەندن و زانین رادبي •

## ( ١٠ ) ـ پەیدا بونا گۆتنێ بێگانە د هەردو شیوادە :

بێگۆمانە کۆ گۆتنێ بێگانە دهەمو زمانا دە پەیدا دبنو هەمـــو زمان بگۆتنێ بێگانە دەولەمەندبونە ، لێ ژبەرکۆ زمانێ کوردی بدو شیوا پەرچە بویە مرۆڤ دترسي کۆبەرەبەرە ژهەڤ دور کەڤن وبین دو زمان •

## ( ١١ ) ـ چێکرنا هن زارا ڤێنو دهەردو شیوادە :

: ـ ئەڤ ژی گەرەکە بقاموسو فەرهەنگا بێنە زانین • لێ گلك جهێ کەسەرو آخینە کۆ هن زاراڤ تێنە چێکرن کۆ گلك ژداخوازێ دورن •

ئەڤ ( مێوە ) ئەگەر نە آبي دارە
کورمانجییە ئەڤ قەدەر لکارە
صفرێ منە صورە آشکارە
زێر نیـە ببێن کۆ کێم عەیارە

سەیدایێ خاني

ئەڤ دینو دەولەت خوندنە ـ خوەندنە •
ئەڤ تاجو شەوکەت خوندنەـ خوەندنە •
ئەڤ سەربلندی خوەندنە
ئەڤ دەولەمەندی خوەندنە ...

٨ـــ٨ـــ١٩٦١ بغداد جگر خوین

# (۱) آخافتن (كلام)

## ـ آخافتن : (۳) پەرچەیە :

### ۱ ـ سادە

ـ آخافتنا سادە ئەوە کۆ ژ پەیڤەکە سادە پێك بێ . وەك :

ـ بارام چو . فەرهاد هات .

ـ شێرین نان خوار . نەسرین نان دخوي ...

دڤردە : ـ آخافتن سادەیە . ژبەرکۆ هەرتەنێ ژ پەیڤەکە سادە پێك هاتي‌یە .

### ۲ ـ تیکەل :

ـ آخافتناتێکەل ئەوە کۆ ژچەند گۆتن وپەیڤا تێکەل دبي وەك:

ـ روستەم بفرۆکە ژ ئەربیل هاتە مال .

دڤردە : ـ آخافتن تێکەلە . ژ چەند پەیڤا پێك هاتي‌یە وەك :

ـ روستەم

ـ بفرۆکە

ـ ژ ئەربیل

ـ هاتە ، مال ... .

روستەم دەستپێکە.هات سالۆخە.ئەڤێ دي هەمي خوەپێگرن .

### ۳ ـ ریزە :

ـ رێزە ئەوە کۆ ژ چەند پەیڤێن خوە سەر بآلیکاریا تیپا پێوەند گهابن هەڤ . وەك :

ـ بارام نان دخوي ئو فەرهاد دکەني ئو شێرین تەشيێ درێسي

دڤرده : ـ چەند پـەیڤێن سەربخـوە بآلیکاریا تیپا پێوەنـد ریز بۆنە •

ـ بارام نان دخوي

ـ فەرهاد دکەني

ـ شێرین تەشيێ درێسي •••

## (٣) ـ پەیڤ ـ الجملة

ـ پەیڤ ئەو چەند گۆتنێ کـۆ دورسـتە مرۆڤ ل داویا وان راوەستي ، ژ بەرکۆ داخوازێ پێکتێنن • وەك :

بارام چۆ زاخۆ

فەرهاد سـوار بۆ

شێرین هاتە مال

نەسرین گەور و بۆزە •••

دڤان چەند پەیڤا دە دورستە کۆ مرۆڤ لداویا وان راوەسـتی ژبەرکۆ داخواز پێك هاتي‌یە •

ـ ژڤان چەند پەیڤا رە تێ گۆتن پەیڤێن تەکوز •

ـ پەیڤا نەتەکوز ئەوە کـۆ نە دورسـتـە مرۆڤ ل داویا وێ راوەستي ژبەرکۆ داخواز نەپێك هاتي‌یە • وەك :

بارامێ سـۆر ••••

شێرینا چاڤ بەلەك •••

ژبەرکۆ داخواز پێك نەهاتي‌یە ـ سالۆخ دپەیڤێ دە کێمە نکارن بێژن : ـ ئەڤ پەیڤ تەکوزن ئو نکارن ل داویا وان راوەستن •

ـ ژبەرکۆ دپەیڤێ دە دو پەرچێ بنیادي هەنە کۆ بێ وان پەیڤ تەکوز نابي :

١ ـ دەستپێكراو •••
٢ ـ سالۆخ

چاواكو دپەیڤێدە ، هن پەرچەێ دي ژي هەنە كو نەبنیادینە لێ خوە پێگرتینە •

ژبو ڤي آواي گەرەكە ئەم پەیڤێ دۆر و درێژ ژهەف ڤەوەژێرن :

## ١ ـ دەستپیكراو :

دەستپێكراو ـ ئەو پەرچە ناڤە كو هەردەم گەرەكە دپێشـــیا پەیڤی دە ژێ بێ سالۆخدان • وەك :

بارام نان خوار
بارام نان خواریە
بارام نان دخوار
بارام نان خوا ربۆ
بارام نان دكرب خوارا
بارام نان دخوي
بارام دێ نان بخوی ••••

دڤان تەڤادە ( بارام ) ناڤە ـ دەستپێكراوە ـ دپێش دەهاتیە ژێ سالۆخ دان ••••

ـ دەستپێكراوە ، ژبەركۆ دپێش دە دەست پێ هاتیە كرن •
ـ ناڤە ، ژبەركو كەسەكي بناڤ دكي •
ـ ژێ هاتیە سالۆخدان ، ژبەركو ژوي پەیڤ تێكرن ئو وي. ئەڤ كار كریە ـ وی نان خواریە •••

## ـ ئەوژي :

## ١ ـ دورستە ( كرۆك )بي : وەك :

ـ بارام نان خواریە •

دڤرده ــ ( بارام ) کرۆکه ــ ناڤه ــ دەسپێکراوه • ژبەرکۆ وي ( نان ) خواریه ــ وي ئەڤ کارکریه •

ــ ( نان ) پێکراوه • ژبەرکۆ ئەو هاتیە خوارن ــ ئەڤ کار بوي هاتیە کرن •

ــ ( خواریه ) کرنا دور بۆري یه • ( ژیدەرێ ) وێ ( خوارن )ه ئەڤ ( خوارن ) ژکرۆك ــ ژ ( بارام ) چویه سەر ( نان ) • ئەڤ (کرن) تیپەره ــ دەرباسه •

ــ کرن ئو پێکراو بهەڤره سالۆخن ژ دەستپێکراو ره •

## ٢ ــ دورستنه ( پیکراو ) بي :     وەك :

ــ بارام     هات     کوشتن ــ کوژرا

ــ نان     هات     خوارن ــ خورا

دڤرده ــ ( بارام ) ئو ( نان ) دەستپێکراون ــ ناڤن پێکراون ، شئونا ( کرۆك ) ستاندنه ــ گرتنه • ژبەرکۆ ( کرۆك ) نه پەنـديیه • ژپێکراو هاتیە سالۆخدان •

ــ با ژهەڤ     ڤەوەژێرن :

( بارام ) دەستپێکراوه ــ ناڤه ــ پێکراوه •

( هات ) کوشتن کرنا بۆری نەپەندییه ژ دەســـتپێکراو ره سالۆخه • وەها رەنگه ( نان ) ژی ولۆیه •

## ٣ ــ دورستنه کۆ هەر تەنها ( ناف ) بي   وەك :

ــ گول سۆره •     گیا کەسکه •••

شێرین گەوره •     فەرهاد رەشه •••

**دڤرده ــ هەر تەنها دەستپێکراو ناڤه • نه (کرۆك) ئونەپێکراوه**

## ٤ ــ دورستە کۆ ( بەرناڤ ) بي • وەك :

ــ ئەو سۆرە ــ ئەڤ گەورە •••

ــ ئەم جوانە ــ ئەو پیرە ••••

دڤردە ــ هەر تەنها ( بەرناڤە ) • نەکرۆك ئونە پێکراوە ئونەناڤە

## ــ ( ناڤ ) ژی :

## ١ ــ دورستە ( پەسن ) بي وەك :

رەنگێ گولێ جوانە

سواریا شێرۆ باشە •

توز ل فەرهاد نەمایە ••• •

## ٢ ــ دورستە کۆ ( ژمار ) بي • وەك :

ــ دو سالن ئەز ژ دەرڤە مە

ــ سێ مرۆڤ ژوێ دەتێن

ــ سەد ( مي ) لبن سیا دارەکێ مەغەل ئێن ••••

## ٣ ــ دورستە کۆ ( پالڤەدار ) بي • وەك :

ــ مەهینا فەرهاد بەزایە

ــ چێلەکا شێرین بشیرە

ــ کەڤۆکا گولچین خوەشکە •••

## ٤ ــ دورستە کۆ ( بالڤدان ) بي وەك :

ــ خانی وەلات پارێزەکی مەزنە

ــ کۆي مللەت پەروەرەکی گەورەیە •

ـ جەزیري هۆزانەکی ناڤدارە
ـ نالي بوێژیکي بناو بانگە ....

## ٢ ـ ( سالۆخ )

ـ پەرچێ دوەم ژ پەیڤێ سالۆخە :

ـ سالۆخ ئەوپەرچەیە کۆلپەي دەستپیکراو تێ،ئوبوی دکارن ژ دەستپێکراو سالۆخبدن . وەك :
ـ شێرکۆ ب مێرانی دەنگ دایە .
ـ بارزان چیاکی بلند و بەرزەیە .

ـ شێرکۆ ناڤە ـ دەستپێکراوە .
ـ دایە کرنا دور بۆري‌یە
ـ دەنگ پێکراوە .
ـ بمێرانی راکیش ئو راکیشراون .
پێکڤە سالۆخن ژبۆ شێرکۆ .

## ـ ( سالۆخ ) ژي

## ١ ـ دبي ( کرن ) بي ـ ( پەیڤ ) بي : وەك :

بارام شیرانی ( خوار ) ....

## ٢ ـ دبي ( ناڤ ) بي : وەك :

ـ روستەم گەرناسە ...

## ٣ ـ دبي راکیش ئو راکیشراو بن . وەك :

ـ فەرهاد ل مالە ....

دڤرده ــ ( کرن ) وندایه • هەریەك ل گۆرا داخوازا خوه دکاری
بیێژي •

## ٣ ــ ( خوەپیگر )

ــ خوه پێگر ئەو پەرچەیه کۆ دپەیڤێ‌دە یان :

### ( ١ ) ــ خوه پیگرێ دەستپیکراوه وەك :

ــ شێرینا ( خەبات‌کەر ) باشه
ــ ئەوا ( خەبات‌کەر ) باشه
ــ فەرهادێ ( گەرناس ) مێره
ــ ئەوێ ( گەرناس ) مێره

### ( ٢ ) ــ یان خوه پیگرێ سالۆخه

### ــ ئەوژي :

### ١ ــ یان رەوشا کارەکی نیشان ددی • وەك :

ــ شێرکۆ ( بسواری ) آژۆته سەر دژمن •
دڤرده ــ ( ب سواری ) رەوشا آژۆتنا شێرکۆ ددی زانین •

### ٢ ــ یان دەمەك نیشان ددی • وەك :

ــ فەرزەنده ( پار ) ژ خوەنده گەهێ دەرچۆ •
ــ ( پار ) دەمەك ددی زانین •

**٣ ـ يان جهەك نيشان ددى • وەك :**

ـ بۆزۆ ژ ( زاخۆ ) تێ •

ـ ( زاخۆ ) جهەك ددى زانين •

**٤ ـ يا سەبۆنى نيشان ددى • وەك :**

ـ سالار ( ژبۆ ) خەبات هاتى يەڤرا •

ـ ( ژبوخبات ) سەبۆنيەك ددي زانين •

**٥ ـ يان آليكارىيەك نيشان ددى • وەك :**

ـ بەرهۆ ( ب گوله ) دژمنێ خوه كوشت •

ـ (ب گوله ) آليكارىيەك ددى زانين •

**٦ ـ يان چەندىيەك نيشان ددى • وەك :**

ـ شێرو ( چار جارا ) كەتيه زندانێ

ـ ( چار جار ) چەندىيەك دايه زانين •

**( ٣ ) ـ يان خوه پيگرێ پێكراوه وەك :**

ـ بارام روستەمێ گەرناس كوشت •

ـ ( گەرناس ) خوەپێگرێ روستەم ئو روستەم ژي ، پێگراوە ژبۆ بارام • ( كوشتن ) ژ بارام تێبەريه سەر روستەم •

## ( ٤ ) ـ یان خوه پیگرێ پیگره   وەك :

ـ هەسپێ قەمەرێ تاري دبەزێ دەركەت •

ـ بارامێ هوزانێ مەزن مرۆڤەكی باشە •

ـ ئەوێ رێزانێ مەزن پیاویكی گەورەیە •

دڤردە ـ ( تاري ) ئو ( مەزن ) خوە پێگرێ خوە پێگرن • یانی پەسنێ پەسنێ دەستپێكراون •

## آورەك :

ـ (جیدەم) ئو (جیگە) ئو راكێش‌و راكێشراو خوە ب(كرنێ) ڤە دگرن ـ خوە ب سالۆخڤە دگرن •



## ( ٣ ) ـ ( گۆتن ) ـ ( كلمة )

گوتن ـ ئەو پەرچەیە کو ژیەکێ بێتر پەیڤەکێ پێك تینی وەك :

ـ شێرۆ رازایە

ـ سالار ژ چۆلێ تێ

ـ بارام ل خوندەگەهێ دخوێنی ....

دڤردە ـ شێرۆ گۆتنەکە . رازایە گۆتنەکە . بەهەڤرە پەیڤەك پێك آنینە .

( سالار ، ژ ، چۆلێ ، تێ ) چار گۆتن بهەڤ رە پەیڤەك پێك آنینە .

ـ ( بارام ، ل ، خوەندەگەهێ ، دخوێنی . ) چار گۆتن بهەڤرە پەیڤەك پێك آنینە .

### ـ ( گۆتن ) ژی :

### ١ ـ یان ژ کارتەکێ پیك تێ وەك :

آو ، آرد ، آش ، آخ ، ال ........

گۆشت ، گۆرن ، گوند ....

### ٢ ـ یان ژ دو کارتا پیك تێ وەك :

ـ باژار ، باران ، بارزان ، بالان ....

### ٣ ـ يان ژ سێ كارتا پيك تێ •

بريڤا ، سليڤا ، ( ره ـ وان ـ دوز ) •••

### ٤ ـ يان ژ چار كارتا پيك تێ وەك :

ـ راهەژاندن ، راقەتاندن ، راكشاندن ، **هلفراندن ، هلقەتاندن**

### ٥ ـ يان ژ پيينج كارتا پيك تێ وەك :

ـ بدارڤەكرن ، بژۆرڤە برن •

### ٦ ـ يان ژ شەش كارتا پيك تێ وەك :

ـ بهەڤ گوهەراندن •••

### آورمك :

**ئەڤ ژێدەرێ رەقــەم ٤ ـ ٥ ـ ٦ چێكــزۆخن • نەبنيادێنە •**
**(( راكێش و راكێشراو ) تێكەل بۆنە ••••**



## ( کارت )

### ـ ژهەر دەنگەکی رە کارەتەك تێ گۆتن :

### ـ ئەوژي :

١ ـ جارنا ژ یەك تیپێ پێك تێ وەك : ( آ )
٢ ـ جارنا ژ دو تیپا پێك تێ • وەك : ( با )
٣ ـ جارنا ژ سێ تیپا پێك تێ • وەك : ( بار )
٤ ـ جارنا ژ چار تیپا پێك تێ • وەك : ( کوشت )

### ـ گۆتن سێ پەرچەیە :

**١ ـ ناف**
**٢ ـ کرن**
**٣ ـ تیپ**



## ١ــ ناڤ ــ ( الاسم ).

ــ ( ناڤ ) ئەو گۆتنە کۆ سەربخوە داخوازێ ددی زانین ئو دەم ئو کرۆك ژێرە نەگەرەکن . وەك :

بارام ، خەسرۆ ، فەرهاد ، شێرکۆ ....
شارەزۆر ، ئەربیل ، مۆش ، وان ... .
آڤ ، دار ، بەر ، با ....
شێر ، شۆر ، مار ، مۆر ، چۆك .....

## ــ ناڤ ٣٣ سيو سێ پەرچەیە :

ژ رێڤە ( ناڤ ) دوپشکە :

**١ ــ تەکناڤ ( اسم الخاص )**
**٢ ــ بیش ناڤ ( اسم الجنس )**

## ( ١ ) ــ تەکناڤ :

ــ تەکناڤ ــ ئەوەکۆ هەر تەنێ مرۆڤـەکی یان تەباکی ، یان تشتەکی بناڤ دکی ، وەك :

بارام ، شێرین ، خەسرۆ ، شێرکۆ ، سیپان ، هەولێر ، دهۆك ، شارەزۆر ، ئەرزەرۆم .....

### ئەوژی :

### ١ ــ یا راستە ناڤە : وەك :

بارام ، شێرین ، سینۆ ، سەیدۆ ، شێرکۆ ، بۆزۆ ....

## ٢ ــ یا ب پەسنەكی خوە تێ ناڤـدان ٠ وەك :

ــ گەورێ ، نازدار ، پەریشان ، شێرین ٠٠٠٠٠

## ٣ ــ یان ب مالباتا خوەتێ ناڤـدان ٠ وەك :

ــ بدرخاني ، باباني ، حەیدری ٠٠٠٠

## ٤ ــ یان ب شونەكێ تێ ناڤدان ٠ وەك :

ــ قزلجي ، آمدي ، شارەزۆري ، حسكەفی ٠٠٠٠

## ٥ ــ یان آلاڤەك دگەل تێ وەك :

ــ كوردستان ، ئەرمەنستان ، هندستان ٠٠٠٠٠

## ٦ ــ یان ب كارەكي خوە تێ ناڤدان ٠ وەك :

ــ باغڤان ، توتن چي ، بەربەر ، سم تەراش ٠٠

## ( ٢ ) ــ بیش ناڤ : یا ( بۆش‌ناڤ ) ٠(اسم الجنس)

پێش ناڤ ئەوە كۆ یاپێشەك مرۆڤ ، یا پیشەك تەبا ، یا پیشەك تشت بدي بناڤ كرن٠ودكارن وی ناڤی لتەك تەكێ وان بكن ٠ وەك:

ــ چیا ، دار ، بەر مرۆڤ ، هۆڤ ، شێر ، شۆر ، شەنگ ، شۆخ شال ٠٠٠٠ ٠

دەشت ، كەو ، قاز ، قولنگ ، پسیك ، مێر ، ژن ، پیاو ، كەچ ، كور ، لاو ٠٠٠٠ ٠

هەروەكو ناڤێ ( چیا ) هاتیە دانین ژ بۆ هەمو چیا رە ولـۆ دكارن ژ یەك‌یەكێ چیا رە بكن ناڤ ٠٠ ٠

ومها رەنگە ئەڤێ دی ژي ولۆنە ٠٠٠٠

## ــ دیسا ناف دو پەرچەیە :

## ١ ــ سادە ناف (بسیط)

## ٢ ــ پارچیم ناف (مرکب)

## (٣) ــ سادە ناف ، یا نافێ سادە

ئەوەکو سەربخوە داخوازێ بدی زانین • وەك :
أبراهیم ، شێرۆ ، رەز ، پەز ، دار ، مزگین ، شێرین ، هاڤین پایز ، گول ••••
هەریەك ژڤا نافا سربخوە بێ کو ناڤەکی دی دگەل بێداخوازێ ددن زانین •

## (٤) ــ پارچیم ناف

ئەوە کو ژناڤەکی بێتر بهەڤە پەرچیمبونە وداخوازێبهەڤرە ددن زانین • وەك :

ئەردەشێر ، شەرەفخان ، ئەزدین شێر ، بەدرخان ، بارام گۆر یەزدي گۆرد ••••

ــ ئەوژي وەکو خویا دکي :

## ١ ــ یا دو نافن وەك :

بدرخان ، گرداهۆل ، ئەرزەرۆم ، شارەزۆر ••••

**٢ ـ یا ناف ئو پەسنە      وەك :**

گرسۆر ، بارام گۆر ، گولي زەر •••

**٣ ـ یا ناف و دەرە      وەك :**

ـ خوەندەگە ، کەڤچیدان ، خوەلیدانك ••••

**٤ ـ یا ناف ئو آلاڤە •      وەك :**

آمەدي ، هەسکەڤی ، ئەرتوش •••



## ( ٥ ) ـ كۆم ناڤ : ( جمع الاسم )

كۆم ناڤ ئەوە كۆ چەند ناڤێن بێ ژمار ئو پيڤان دخـــوە دە دگري ـ كۆم دكي وەك :

| تەك ناڤ | كۆم ناڤ | | | |
|---|---|---|---|---|
| سوار | سـواران ، | سـوارێن ، | سوارن | سواريت |
| گول | گولان ، | گولێن ، | گولن ، | گولێت •••• |
| هەسپ | هەسپان ، | هەسپێن ، | هەسپن ، | هەسپێت••• |

## نيشانێ كۆم ناڤ ئەڤن :

( آن ، أن ، أێن ، أێت ، أێد ، گەل )

**آورەك :**

گەلەك جاران ( ن ) ژ داويا ( آن ، أێن ) تێ راكرن • وەك :

| تەك ناڤ | كۆم ناڤ | | كۆم ناڤ |
|---|---|---|---|
| سوار | سواران | ( ن ) | سوارا ••• |
| گول | گولان | ( ن ) | گولا ••• |
| هەسپ | هەسپان | ( ن ) | هەسپا ••• |

ـ ژلەورا دكارن بێژن : ـ سـوارا تالانێ مە بر •
ل شۆنا ـ سواران تالانێ مەبر •

ـ گولێ مە گەش‌بون • ل شـونا گولێن مە گەش‌بون •
ـ هەسپێ مە هاتن • ل شونا هەسپێن مە هاتن •
ـ شێرين گولا دچني • ل شونا شێرين گولان دچني •

## آوالە :

چە دەما د ( کرنێ ) دە نیشانا کۆم هەبي د ناڤ دە نیشانا کـۆم دورستە کۆ بێ آڤێتن • ژبەرکۆ کۆم بونا دو نیشانێ کۆمکرنێ یەك رەنگ ئو یەك دەنك ژ گراني پێڤە ب کارتشتەکی نایێ •

ــ ئەگەر بێژن :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڤان | مرۆڤان | نان | خوارن |
| ١ | ٢ | | ٣ |

وێ چاخێ ٣ نون کۆنیشانا کۆمن دپەیڤەکێ دەکۆم دبنــدچڤن بێ گۆمانە کۆ کۆمکرنا ســێ نیشانا بهڤ رە گــرانی د آخاڤتنێ دە پەیدا دکی •

ــ لێ کۆ بێژن :     ــ ڤا مرۆڤا نان خوارن •

وێ چاخێ داخواز تێ خویاکرن ۆ گرانی نامێني •

ــ وەها رەنگە ( ایت ، أید ) ژ شیوەێ کورمانجی بگر رابونە : تەنێ ل ناڤ هن ایل و بەرێ کورمانجا مانە •

ــ لێ ولۆ دیارە کۆ دجهێ پاش دەماي دە گلك خــویا دکن • هەروەکۆ هاتە خویاکرن ژ گراني پێڤە توکاری ناکن •

ــ گایت مە هاتن     ــ     گاێ مە هاتن •

ــ گاید مە هاتن     ــ     گاێ مە هاتن •••

( گەل ) تەنێ دگۆران دە ــ دوەلاتێ ئەردەلان دە ، ژبۆ کـۆم هاتیـە     وەك :

مەرگەل ، کورد گەل ، چیا گەل •••

( آت ) دشیوەێ هــن سۆرا دە ژ بۆ کــۆم تێ لێ لجهم مــن ژفارسي هاتیـە • ( دێ ــ دێهات ) •

## آواك :

چه دەما دكرنا تێپەرا بۆری ده كرۆك ئو پێكراو بهەف رەبجڤن ، كۆم بونا ( كرنێ ) لگۆرا پێكراوە وەك :

وي سێڤەك خوار — وا سێڤەك خوار
وێ سێڤەكخوار — وا سێڤەك خوار
من سێڤەك خوار — مه سێڤەك خوار
ته سێڤەك خوار — وه سێڤەك خوار

ـ د هەموا ده سێڤەك تەكە ژلەورا ( خوار ) تەك هاتی‌یه •
ـ لێ چه دەما سێڤ كۆم بن • وێ‌كرن ژی كۆم بيي وەك :

من سێڤن خوارن — مه سێڤن خوارن •
وێ سێڤن خوارن — وا سێڤن خوارن •
وي سێڤن خوارن — وا سێڤن خوارن •
ته سێڤن خوارن — وه سێڤن خوارن •

ـ لێ دكرنا تێپەرێ ( ناكا ) و ( هێتێ ) ده بركا ڤي ( آواي ) تێ

## كرناناكا كرنا هيتێ

ئەز سێڤەكێ دخوم — ئەم سێڤەكێ دێ بخون
تو سێڤەكێ دخوي — ون سێڤەكێ دێ بخون
ئەو سێڤەكێ دخوي — ئەو سێڤەكێ دێ بخون
ئەز سێڤنا دخوم — ئەم سێڤنا دێ بخون
تو سێڤنا دخوی — ون سێڤا دێ بخون
ئەو سێڤا دخوی — ئەو سێڤا دێ بخون ••••

دڤا تەڤا ده ( كرن ) لگۆرا كرۆكه •

**آواك :**

جارنا كۆ دوناڤ لپەیهەڤ تێن ، دورستە كۆ ( كرن)تەكبێ دروستە كۆ كۆم بێ • وەك :

بەرف و باران دبارى •

بەرف و باران دبارن •

ـ گول و گیا شین بو — گول و گیا شـین بۆن •••

ـ خەو و مرن یەكە — خەو و مرن یەكن •••

ـ دلو جەرگم سۆتا — دلو جەرگم سۆتان

* * *

## ( ٦ ) ـ دەم ناڤ : ( اسم زمان )

دەم ناڤ ئەو ناڤ كۆ دەمەك ددی بناڤكرن ـ ددی زانین وەك :

ـ چـاخ ، دەم ، كات ، سال ، رۆژ ، شـەڤ ، گاڤ ، كێلیك ، بیـتك ، قاس ، ساعەت ، چاریك ، سێیەك •••

ـ ایرۆ ، دۆه ، پێر ، پتر پێر • پار ، پێرار پتر پێرار ••••

ـ ڤێگا ، أێستا ، ناكا ، نها ، نهۆ ، هێژا ، هێشتا •••

ـ آنها ، آناكا ـ آنۆكا ـ نۆكە ••••

ـ أین ، شم ، یەك شەم ، دو شەم ، سێ شەم ، چار شـەم ، پێ شەم • وەها رەنگە ••• •

# ( ٧ )ـ جي ناف : ( اسم المكان )

ـ جي ناف ئەوە كۆ شونەكێ ـ جهەكیـ دەرەكێ بناڤدكی ـ ددی زانین : وەك :

جي ، گە ، لان ، دان ، ســـتان ، خان ، لیـس ، پینگ ، وار ، شـكەڤت ، نەوال ، نەهێل ، گلی ، دەر ، شون ، پشت ، پاش ، پێش ، رەخ ، جهم ، بال ، با ، لاي ، تەنشت ، نك ـ كن ، سەر ، بن ، ژۆر ، ژێر ، خوار ، باني، راست ، چەپ، رۆژهلات، رۆژآڤا، راژۆر، راژێر آلي ....

## جی ناف دو بابەتن :

١ ـ خوەسەر

٢ ـ پێـكهاتی

ـ جی ناڤێ خوەسەر ـ سەربخوە داخوازێ ددی زانین وەك :

ـ خان ، سەرا ، ئەیوان ، دێر ، ....

هەریەك ژڤا ناڤا سەر بخوە شونەكێ ، جهەكی ددی بناڤكرن ـ ددی زانین .

## جی ناڤێ پیك هاتی ـ چیكرۆخ

ـ ئەوە كۆ بآلـكاریا ناڤەكی دی ، یان آلاڤەكە دی داخوازێ بجي دكی ـ بناڤدكی ـ ددی زانین ... وەك :

ـ كوردستان ، گولستان ، خوندەگە ، شـارگە ، بارخـانە ، نەخوەشـخانە ، چایدان ، كەڤچیدان ...

دڤردە ـ ب آلیكاریا ( ستان ـ گە ـ خانە ـ دان ) ئەڤ ناڤ چێبونە ـ هاتنە چێكرن ـ پێك هاتنە .

## آورەك :

ــ ژبــەر ڤی ( آواي ) : ( هێلین ) و ( کــولین ) و ( کادین ) دەردکەڤن • دڤابو بهاتا گۆتن : ( هێلان ) ، ( کۆلان ) ، و ( کادان ) • لیژبەرکــۆ هێلان جهــێ زارۆك و مندالایــە ، و ( هێلین ) جهــێ چێلیکێ تلۆر و چڤیك و چوکایە ، نەخوەستنە بـەهەڤ شـاش ببن • وەها رنگە ( کۆلان ) سەر ملێ مرۆڤا وجهێ هلگرتنا زارۆکایــە • و ( کولین ) جهێ دانینا ڤینایە • نەخوستنە وەك هڤ بێنە گۆتن • ( کادین ) جهێ هلانینا کائێ یە ژ هاڤینا دە کــورد ( کا ) خــوە دخن ( کادین ) و لوۆدا • ئەگەر ئەم بێژن : ــ ( کادان ) جهێ ( کائێ ) وێ چاخێ ( ژێدەرێ ) دانا کائێ ( کادان ) و جهێ کائێ ( کادان ) بـەهەڤ شـاش دبن •

بکورتی ژبۆکۆ ب هڤ شـاش نەبن ئــەڤ سێ گــۆتن ژ رێ دەرخــتنە • ژبەرکۆ آلاڤا آلیکار ( لان )ە ، نە (لین)ە کورلێ بـنەرن



## ( ٨ ) ـ آلاف ناف ( اسم الالة )

ـ آلاڤناف ئەوەكۆ آلاڤەكى بناف‌دكي • وه ك:
طۆپ ، تڤنگ ، شور ، خەنجەر ، تیر ، كەڤان ، دۆخك ••••
مێكوت ، تەڤشۆ ، هەستیف ، خاچرگان ، دوستان، دەرخون••
دۆلاب ، مەر ، بڤر ، تەڤر ، چاكوچ ، داس ، قەیناغ ••••

### ئەوژی ، دو پەرچەنە :
### ١ ـ خوه سەر
### ٢ـ چیكروخ

### ١ ـ آلاڤناڤی خوه سەر

ئەوه كۆ سەرب‌خوه داخوازێ ددی خویاكرن • وەك :
ـ شور ، خەنجەر ، تیر ، كەڤان •••

### ٢ ـ آلاڤناڤی چیكروخ ـ پیكهاتی

ـ ئەوه كۆ ب‌آلیكاریا خورده پاشه كێ داخوازێ ددی زانین • وەك :
ـ بادەك ، بررەك ، هەڤرنگ ، بێژنگ ، تڤنگ ، كولنگ • دەست‌مال ، پێش‌مال ، بەرف مال ••
ـ وا خویایه كۆ ( ئەك ، انگ ، مال ) آلاڤێن كۆ آلیكار وچێكروخن •
ـ لێ ( مێكوت ) و ( كلچیڤ ) ژبەر ڤي آوای دەردكەڤن • تەنێ دكارن بێژن : ( مێكوت ) نه دوپەرچەیه • لێ ئەم نكارن رێكی ژ كلچیڤ ره پەیداكن •



## ٩ ـ بچوك ناڤ (اسم المصغر)

ـ بچوك ناڤ،ئەوە كۆ داخوازا خوە بچوك دكيئەوژى :

### ١ ـ يا ژبۆ شيرانييە ، وەك :

ـ خورشيدكۆ ، خانىكێ ، فەرهادكۆ ، شێرينكێ ...
ـ سوريكا ، شەوقيكا ، حەمديكا ...
ـ كورك ، لاوك ، كەچك ، خوەشك ....

### ٢ ـ يا ژبۆ كيماس يە وەك :

ـ هوڤك ، هرچك ، پسيك ، كتك ....
ـ آلاڤێ بچوكی : ( ك كە كێ كا كۆ ( ل لە ) ۆ ) وەك :
ـ كورك ، كچك ، پاچك ، گۆلك ، بەرخك ، كارك ...
ـ بزنۆكە ، بەرخۆكە ، كەپرۆكە ، رەڤۆكە ....
ـ حليمكێ ، فاطمكێ ، رەوشكێ ، شێرينكێ ...
ـ سوريكا ، شەوقيكا ، بەدريكا ...
ـ خورشيدكۆ ، روستمكۆ ، حەسەنكۆ ....
ـ عبدۆل ، بەرخۆل ، حەمۆل ، مەنجۆل ...
ـ فاتۆ ، زەينۆ ، وەسۆ ، غەمۆ ، فارۆ ....

* * *

## ١٠ ــ نیرو مێ ( تذکیر و تأنیث )

ــ ناڤ هەمو دکارن ب ٣ سێ پەرچا بەش بکن •

### ١ ــ نیر
### ٢ ــ مێ
### ٣ ــ نیرو مێ

هەروەکو دشیوەێ کورمانجی دەهاتیە زانین و خویاکرن هن یێشێ ناڤ هەنە کۆ دادە نێرو مێ ئەشکەرانەــلهەمبەر هەڤن وەك :

مێر ــ ژن
بەران ــ مي
نێری ــ بزن
هەسپ ــ مەهین

ــ لێ هن یێش هەنە کۆ نێرو مێ دوان دە وەکە هەڤن وەك :
ــ هرچ ، شێر ، گور ، کەڤۆك •••

وێ چاخێ گەرەکە ئەم گۆتنا : ( نێر ) و ( مێ ) بواقە دەینن تا وەکو نێرو مێ ژ هەڤ ناس بکن • بێ وەکو یێژن :

| | |
|---|---|
| هرچا مێ | هرچێ نێر |
| شیرە نێر | شێرە مێ |
| نێرە کەڤۆك | مێ کەڤۆك •••• |

ــ ئەڤ آوا ژی گەلەك گران و ناکۆکە • ژلەورا کــورمانجا

نێرو مێ بآلاڤا ژهەڤ دانە آلي : دپالڤدانێ دە ( آ ) نیشانا ( مێ )یە

( ێ ) نیشانا نێره    وەك :
ـ هەسپێ قەمەر • مەهینا قەمەر دکۆکا خوەده ـ هەسپ ـ ئێ قەمەر • مەهین ـ آقەمەر • لێ ژبۆ سڤکی دپەیڤێ دەبهەڤەگرێدانە ۋ بویە : هەسپێ قەمەر ـ مەهینآ قەمەر •••
وێ چاخێ ب جارەك نێرو مێ ژ هەڤ جدا دبن •
ـ لێ دبەرناڤێ کرنا بۆری دە چاوا کو دنیشاندانێ دە : ( ئێ ) ژبۆ ( مێ ) ۋ ( ي ) ژبۆ ( نێر ) تێنە گۆتن •    وەك :
وێ خواریە ـ ( مێ ) • وي خواریە ( نێر ) • ڤێ خواریە ( مێ )• ڤی خواریە ( نێر ) • ئەڤ هەر تەنێ دتەکێ وندا ۋ تەکێ ( نیشاندان ) دە تێ •

## تەکێ وندا بەرناڤ    تەکێ نیشاندان

| مێ | نیر | مێ | نیر |
|---|---|---|---|
| ڤێخواریە | ڤی خواریە | وێ خواریە | وی خواریە |
| ڤێ گۆتیە | ڤي گۆتیە | وێ گۆتیە | وي گۆتیە |
| ڤێ کوشتیە | ڤی کوشتیە | وێ کوشتیە | وي کوشتیە |

ئەڤ آوا دبەر ناڤا دە وێ خوەشتر بێ خویاکرن •

## ـ دیسا ( نیرو مێ ) دو پەرچەنە :

١ ـ براستی
٢ ـ بهیستی

١ ـ نێرو مێ ئێ براستی کۆ دهەمبەر هەڤ دەخویا دکن هەر

وەکو مە دەرباس کریە :

گا — چێلەك
نێری — بزن
بەران — مي
مێر — ژن

٢ — لێ ئی بهیستی گەلەكدژوارە کۆمرۆڤ کاربيژوارەآواکی پەیداکي • تەنێ ئەم دکارن چەند آوایێ جیاواز ۆ نەتەکوز بدن زانین کۆ هنك خوندەوارێ مە پێ آگاهدار بین •

مێ

## — ئەم کارن بیژن :

١ — چڤا ستێر هەنە مێنە •
٢ — ژ ( گەلي ) پێڤە چڤا جهێ نزم د ( قادێ ) دە هەنە مێنـە •
٣ — چڤا دارێ ل سەر خوە هەنە مێنە •
٤ — ژچەمو روبار پێڤە آڤ هەمي مێیە
٥ — دچەکێ شەر دە ژ (بەروشور وکڤان) پێڤە ایدی هەمیمێنە
٦ — آلاڤێ خوارنێ ژ ( کەڤچي ) پێڤە ایدی هەمی مێنە
٧ — دکنجێ راخستنێ دە ژ ( کولاڤ و بالیف ) پێڤە ایـدی تەڤ مێ نە
٨ — بەرێ دارا هەمی مێنە •
٩ — کۆمناڤ و ژێدەر ناڤ ژ ( کەن ) و ( گري ) پێڤە ایـدی هەمی مێنە •
١٠ — دکنجێ لخوە کرنێ دە : قوندەرە ، شەکال — کلاشـس ،

چارۆخ ، گۆرە ، پۆتین ، جەزمە ، ساق ، پشت ، کەمبەر ، قـوّلان ، عەبا ، شالك ، چەفي ، دەسمال ، خزێم ، گوستیل مێنە •

## ـ نیر ـ

١ ـ دجهێ نزمو کۆلاي دە تەنێ ( گلي ) نێرە •

٢ ـ د آڤێ دە چەم و روبار نێرن •

٣ ـ ژوان تشـتێ ل ژورێ قادێ ( با ) و ( ئەزمان ) نێرن •

٤ ـ دکنجێ‌ل‌خوەکرنێ دە: کوم، کراس، کۆلۆس، کەرك،شال شاپ ، بازن ، خلخال ، فستان نێرن •

٥ ـ ( دار ) کۆ ژ شینائ‌کەت ـ هاتە برین ، راکرن نێرە

٦ ـ دآلاڤێ خوارنێ دە ( کەڤچی ) نێرە

٨ ـ د ( ژێدەر ـ مصدر ) دە ( کەن ) و ( گری ) نێرن

٩ ـ دچەکێ ( شەر ) دە : شور ، کەڤان ، بڤر ، تەڤر ، بەر نێرن

١٠ ـ د آڤانیا دە : بازار ، شار ، گـوند ـ دێ ، خانی ، کاڤل دیوار ، آخۆ ، نێرن •

١١ ـ بەرێ لەما هەمي نێرن •

١٢ ـ دچیـا دە : ژ ( تات ، لات ، بـەلت ، آخ ) پێڤە ایـدی هەمی نێرن •

لێ ئەم نکارن تەڤا بدارڤەکن ژبەرکۆ بیهیـتن تێنە زانین •

وەها رەنگ هن تشتێ دي ژي هەنە کۆ بڤی آواي تێنە خویاکرن



## ١١ ـ پەسنو پەسن دراو ( الصفة والموصوف )

### ١ ـ پەسن :

ئەوە كۆ بوي پەسنێ ( كەس ) یان ( تەبا ) یا ( تشتكی ) تێكرن وەك :

ـ بارامێ( سۆر )
ـ گایێ ( رەش )
ـ بەرفا ( سپي )
ـ زەنجیرا ( گران )
ـ مرۆڤێ ( چێ )

### ٢ ـ پەسن دراو :

ئەوە كۆ پەسنێوی تێ كرن :

گەردكە ( پەسن دراو ) هەردەم لپێش بي و ( پەسن) لپاش بي لێ هن جارا پەسن دكەڤی پێش ، وێ چاخێ بهڤەرە دبن ناڤەك یا گۆتنەك . وەك :

سۆر گول ، شێ بـك ، شەكەركەن .....

### ـ پەسن ژی دو پەرچەیە :

١ ـ پەسنێ راستی
٢ ـ پەسنێ چێكروخی

## ــ پسنێ براستی چار پەرچەیە :

١ ــ تام ــ شۆر ، شیرین ، ترش ، تال ، توژ ...
٢ ــ رەنگ ــ سۆر ، سپي ، رەش ، زەر ، کەسك ...
٣ ــ کیماسي ــ کن ، کورت ، کۆر ، کەر ....
٤ ــ زێدای درێژ ، ستور ، قالند

پەسنێ چێکروخي . ئەوە کۆ بخـوە نەپەسنە لێ مرۆڤدکی پەسن . وەك :

ــ گەرناسي ، سواري ، جواني ..



## ١٢ ــ پالقدار و پالقدیر : ( مضاف و مضاف الیه )

ــ پالقدارو پالقدێر ، دو ناڤن کۆ تمئێ پێشي پالا خـوە ددی ئێ پاشي وەك :

ــ بازنێ زێر . خەنجەرا زیڤ ...

### ئەوژی :

### ١ ــ یان ئێ پاش خوە دیێ ئێ پیشيیە . وەك :

ــ شورێ بارام ، رەزێ خورشید
ــ گوهارێ شێرین ، خەنجرا من ...

### ٢ ــ یا ئێ پیشـــي ژبوئێ پاشيیە . وەك :

ــ زینێ هەسپ ، کالانێ شور
ــ آلفێ گا ، هەفسارێ مەهینێ ...

**٣ ـ یا ئێ پیشي ژئێ پاشي‌یە . وەك :**

ـ کورێ گەورێ ، کەچا رەوشێ
ـ بازنێ زێر ، خەنجەرا زیڤی ...

**٤ ـ یائێ پاشي جي‌دەمە ژبۆ ئێ پیشي . وەك :**

ـ هەورێ بهارێ شەڤرەشا زڤستانێ
ـ بەرێ بایزێ ....

**٥ ـ یا ئێ پاشي جي‌گەهێ ئێ پیشي‌یە . وەك :**

ـ بەرفا زنێر ، گیایێ چولێ
ـ آڤا بێرێ ، گەنمێ کەوارێ ....

**٦ ـ یا دناڤبەرا وا دۆستنانی هەیە . وەك :**

ـ هەڤالێ سۆرۆ ، دۆستێ سلۆ
ـ مرۆڤێ زەرێ ....

**٧ ـ یا ئێ پاشي وەك ئێ پیشي‌یە . وەك :**

ـ تیرێ مژگان ، تیپێ زولفان
ـ کەڤانێ ئەبرو ، هنارێ رووان ...

**٨ ـ یا ئێ پاش پەسنێ ئێ پیشي‌یە . وەك :**
**گایێ رەش ، برانێ سۆر ...**

* * *

## ١٢ ـ ژمار ناف      ( العدد )

ـ ژمار ناف ـ ئەوەكو مرۆڤ، تەبا ، تشت پێ تێنە ژمارتن وەك:
ـ یەك مرۆڤ ، دومرۆڤ ، سێ مرۆڤ ، چار مروڤ •••
ـ یەك شێر ، دو شێر ، سێ شێر ، چار شێر ••••
ـ یەك دار ، دو دار ، سێ دار ، چار دار ••• •

## ـ ژمار چار پەرچە خویا دكن :

١ ـ بنگهی
٢ ـ روتبي
٣ ـ پشكی
٤ ـ شكەستي

## ١ ـ ژمارا بنگهی ژي دو پەرچەیە :

١ ـ دبێش ناف دە تێ : مرۆڤەك ، شێرەك ، دارەك •••
٢ ـ د تەكناف دە تێ: شێرو، زۆرۆ ، سەیدۆ كورێ رەشۆنە••
ـ دیا پێشي دە گەرەكە ژمارەك دگەل بێ وەك :

یەك ، دۆ ، سێ •••••
ـ مرۆڤەك    دو مرۆڤ    سێ مرۆڤ •••
ـ شێرەك    دو شێر    سێ شێر •••
ـ دارەك    دو دار    سێ دار •••
ـ دیا پاشي دە ناڤێ ژمار نەگەرەكە •   وەك :
ـ شێرۆ ، زۆرۆ ، سەیدو كورێ رەشۆنە•
یان ـ شێرۆ و زۆرۆ و سەیدو كورێ رەشۆنە ••

## ٢ ـ ژمارا روتبي ب سێ آواتێ :

١ ـ يەكەم ، دووەم ، سێيەم ٠٠٠٠
٢ ـ يەكمە ، دۆمە ، سێمە ٠٠٠
٣ ـ يەكمين ، دۆمين ، سێمين ٠٠٠

ـ لێ جارنا دبێژن : ـ آيەكێ ، آددوا ، آسیسيا ، آچارا ٠٠
يان : ـ بزنا پێشي ، بزنا ناڤي ، بزنا پاشي ٠٠٠

## ٣ ـ ژمارا پشكي ، بدو آواتێ:

١ ـ دۆ دۆ ، فەر فەر ، جۆت جۆت ٠٠٠
٢ ـ يەك يەك ، دۆ دۆ ، سێ سێ ٠٠٠

ـ دەما بێژن : ـ دو ذووا بدە من ! ئەم دۆزا چارا ٤ دكن
ـ لێكۆ بێژن : دودوا بدە من ئەم دۆزا ٢ دكن ٠
ـ دەما ( ڤەبژێ ) دگەل ژمارێ بێ ئەم نكارن بێژن :
دو دۆ مرۆڤ ٠ سی سێ پەز ٠٠٠ گەردكە بێژن : دو مرۆڤ ٠٠
هەروەها دڤێ ئەم زانبن كۆ ( دو دۆ ) بداخوازا ( دۆ ) يە ٠ۆ
( سیسێ ) بداخوازا ( سێ )يە ٠ ( دو دۆ ، سیسێ ) چەوت هاتنە ٠
ژبەركۆ ( دۆ ) بداخوازا ٢يە ٠ ئەگەر بێژن : ( دۆ ـ دۆ )دبي چار
وها رەنگە سێ ٣ يە ٠ دما بێژن : ( سێ ـ سێ ) دبي ٩ نەھ ٠

ـ بآورا من كورمانج دەست ژڤي آواێ : ( دو ـ دو ، سی ـ سێ ) بەردن ٠ چاكترە ٠ بێگۆمانە : يەك ، دو ، سێ ٠٠٠ خوەشترە ژ يەك ، دودو ، سیسێ ٠٠
ـ وێ چاخێ سەرگێژی نامێني ٠
ئەم كارن بێژن : سێ پەز هاتن ، دو مرۆڤ هاتن ٠٠ لێ نكارن بێژن : سیسێ پەز هاتن ، دودۆ مرۆڤ هاتن ٠

## ٤ ـ ژمارا شکەستي :

ئەوە کۆ ژ کۆمەك تشت هنەکی بخوازی • وەك :
سێ‌یەك ، چاریەك ••••
سێ‌یەکا مالێ‌تە دخوازم بدم بلەنگازا ••••
دڤردە ـ مال دکی ( سێ ) پشك و یەکێ دخوازی بدی بەلەنگازا •
ـ لێ ئەڤ ( آوا ) ژ ( سێ ••• ) دەست پێ‌دکی • ( یەك ودۆ ) ژبەر دەر دکڤن • د ( یەك و دوا ) دە • دبێژن : ـ نیڤێ من ، و نیڤێ‌تە یا : یەکە من ویەکە تە ••• ئەڤ ( آوا ) بەرژۆر هلدکشي •••

## ـ دیسا ژمار دبي ٣ پەرچە :

١ـ سادە ژمار
٢ ـ زێدە ژمار
٣ ـ کەرتە ژمار

## ١ ـ سادە ژمار

ئەوەکۆ گۆتنێ وی سادە بن • وەك :
ـ یەك ، دۆ ، سێ ، چار •••
یانی ژ یەکێ تا دەها ، وناڤبەرا هەر دو کەرتا ٢٠ ـ ٣٠ ـ ٣٠ـ ٤٠ ـ ٥٠ ••••

## ٢ ـ زیدە ژمار

ئەوە کۆ دناڤبەرا ١٠ ـ ٢٠ تێ وەك :
ـ یازدە دوازدە سێزدە •••

ـ دكۆكا خوه ده : يەكو دەھ ، دۆ و دەھ سێو دەھ ...
وەكە ژمارا ژنێ گوندی ونەخوندی ..

### ٣ ـ كەرتە ژمار :

ـ ئەوە كۆ كەرتێ ناڤ ژمارێ ددی بناڤكرن . وەك :
١٠ دەھ ، ٢٠ بیست ٣٠ سیە ٤٠ چل ...
سەد ... هەزار ... ملیۆن ...

### آورەك :

ـ ژمارا كوردي لپەي هەڤ و ژ ژۆر دە تێ خوار وەك :
٤٤٤٤ چار هزار و چار سەد و چل و چار ...



## ١٤ ـ ژیدەر ناڤ : (المصدر)

### ژیدەر :

ئەوە كۆ چە دەما ئەم ( ن) نیشانا ژێدەر ژێ راكن (كرنابۆري) بمێنی . ؤ دەم و كرۆك ژێ رە نەگەرەك بن .

| ژیدەر | كرنا بۆري | كرناناكا | كرناهینێ | فەرمان |
|---|---|---|---|---|
| خوارن | خوار | دخوي | دێبخوي | بخوە |
| كرن | كر | دكي | دێ بكی | بكە |
| كوشتن | كوشت | دكوژی | دێ بكوژی | بكوژە |
| چـون | چـو | دچي | دێ بچي | بچە... |
| هاتن | هات | تێ | دی بێ | وەرە |

کەنگی نیشانا ژێدەر (ن) ژڤان گۆتنا بێ راکرن بێ‌گومان کرنا تێز بۆری دمێنی • ژێ رە دبێژن : ( ژێدەر ) ژبەرکۆ ( کرن ) هەمو ژ وی تێنە دەر •

ــ نیشانێ ژێدەر چارن : ( آن أین ئون أن ) لێ نیشانەکــە دي

ژي هەیە د ژێدەرێ یائي دە تێ ( ي )یە وێ چاخێ ئەم کارن بێژن :

## آورەك :

# نیشانێ ژیدەر ( ٥ ) پینجن

ئەم کارن ژ ڤي ژێدەری رە بێژن :

) هشکە ژێدەر ( ژبەرکۆ ( کرن ) ژێ دەرناچی • وەك :

ــ سواري ، دۆستاني ، مێراني ، شڤاني ، گراني ، نەزاني ، خەزانی ، دزي ، پیــي ، باشي ، قەنجی •••

دڤا هەموا دە ( کرن ) پەیدا نابي • لێ کەنگــی ئەم بخــوازن ( کرنێ ) ژوان چێکن ( بون ) یا ( کرن ) بوان ڤە داتینن و دبێژن :

ــ سواربو ــ سوار کرن ، دزي‌کرن ، •• •لێ هنك ژوان هەر بجارەك ( کرن ) ژوان چێ نابن • وەك :

خزاني ، شڤاني ، نەزاني ••••

ــ دڤێ بێ زانین کۆ ئەڤ ( یي ) نە ( بالڤدانە ــ نسبتە ) وەك :

سلیماني ، بەهدیني ، هەولێري ، کوردي •••

## آورەك :

ـ ئەم کارن بێژن : ( ن ) تەنێ نیشانا ( ژێدەرە ) لێ ئەڤێ دي کۆ لپێش ( ن ) تێن تەڤگەرن ژ گۆتنێ تێنە ژمارتن •

هن زمان زانێ کورد دبێژن : ( ژێدەرێ ) ( دالي ) و ژێدەرێ ( تائی ) وەك :

( کردن ــ کوشتن ) • لجەم وان ( دن ــ تن ) نیشانا ژێدەرن• لێ لجەم من ئەڤ آور نەراستە • ژبەرکۆ چە دەما ئـەم کرنا بۆرێ ژڤان هەردو ژێدەرا دەرخن ( د ــ ت ) بکرنێ ڤە دمێنن

| نیشانا ژیدەر | کرنا بۆرێ | ژیدەر |
|---|---|---|
| ان ــ ن | کرد ــ کرد وە | کردن |
| ان ــ ن | برد ــ بردوە | بردن |
| ان ــ ن | دەرکرد ــ دەرکردوە | دەرکردن |
| ان ــ ن | کوشت ــ کوشتوە | کوشتن |
| ان ــ ن | سۆت ــ سۆتوە | سۆتن |

وا دیارە کۆ ( ان ــ أ ــ ن ) • ئەڤ تیپا ( أ ) بجارەك دشیوەێ سۆرانی دە پەیدا نابي ــ یان آگاهدار نابن کۆ هەیە ، ئەوژي سوجێ وایە کۆ بنگهێ آوایێ ڤیـسین ژبۆ زمانێ کوردی بتیپێ عربي دانینە • تیپا ( ڤــ ژ) ئەگەر دشیوەێ سۆراني دە پەیدا نابن، یان گلك‌کێمن لێ بێ‌گومانە کۆ تیپا ( أ ) دسۆرانی دە گلــك هـــەیە تەنێ پێ‌آگاه نەبۆنە • وەکۆ : أبراهیم ، أنگلیز ••••

## ــ دیسا ژیدەر دو پشکن :

١ ــ ژێدەرێ سادە

٢ ــ ژێدەرێ پارچیم ــ لێکدراو •

## ـ ژيدەرێ سادە :

ئەوەكۆ هەرتەنێ ژگۆتنەكە سادە پێك هاتبي • وەك :

ـ چوين ، هاتن ••••

ـ خوارن ، كوشتن

## ـ ژيدەرێ پارچيم ـ ليكدراو :

ئەوە كۆ ژگۆتنەكێ پێتر ب هەڤە هاتبي پارچيم كرن وەك :

ـ رازان ، رادان •

ـ باركرن ، سەربرين ••••

## ئەوژی : ـ

١ ـ يا ناڤەك دپێش دەتێ :

ـ نان خوارن ، ژن آنين ، جۆت كرن •••

٢ ـ نا پەسنەك لپێش تێ :

ـ باشكرن ، چێكرن ، سوركرن ، زەركرن ••••

٣ ـ يا تيپەك لپێش تێ :

ـ ژبەركرن ، لێدان ، ژباژێر هاتن •• •

٤ ـ يا آلاڤەك دپێش دە تێ :

ـ هلفرين ، پێكەنين ، دابەزين •••

## ـ ديسا ژيدەر دوپەرچەيە :

١ ـ ژێدەرێ كرنا تێپەر

٢ ـ ژێدەرێ كرنا تێنەپەر

## ١ ـ ژيدەرێ كرنا تێپەر :

| ژيدەر | كرنابۆري تێپەر | پەيڤ |
|---|---|---|
| كـــرن | كـــر | بارام كارێ خوە ـ كر |

| | | |
|---|---|---|
| راکرن | راکر | فەرهاد بارێ خوە ــ راکر |
| خوارن | خوار | شێرۆ نان خوار |
| جۆت کرن | جۆت کر | رەشۆ جۆتێ خوە کر ... |
| کوشتن | کوشت | سۆرۆ دژمنێ خوە کوشت ... |

٢ ــ ژێدەرێ کرنا تێنەپەر :

| ژیدەر | کرنابۆري تێنەپەر | پەیڤ |
|---|---|---|
| چون ــ چوین | چو | بارام چو |
| هاتن | هات | فەرهاد هات |
| مرن | مر | دژمن مر |
| رازان | رازا | خەوار رازا |
| پالدان | پالدا | چەکۆ پالدا |

## آواك :

ژێدەرێ تێنەپەر چاوا دبي تێپەر ؟

چاوا کۆ دەرباس بویە هاتە زانین کۆ نیشانێ ژێدەر ژ ( ي ) پێڤە چارن : ( آن أن اين ئون ) ــ ( ن ) ٠ چەدما کۆ ئەم بخوازن ژێدەرێ تێنەپەر بکن تێپەر گەرەکە ئەم آلاڤا ( آندن ) لشونا (آن ــ ان ــ این ) دەینن وەك :

| ژیدەرێ تێنەپەر | ژیدەرێ تێپەر |
|---|---|
| رازان | رازاندن |
| بەزین | بەزاندن |
| مرن | مراندن |

وەها رەنگە ( آند ) کرنا تێنەپەر دکی تێپەر وەك :

| ژێدەرێ تێنەپەر | ژێدەرێ تێپەر | کرنا تێنەپەر | کرنا تێپەر |
| --- | --- | --- | --- |
| شوات | شەوتاندن | شوتي | من ئەو شەوتاند |
| رزین | رزاندن | رزیا | من ئەو رزاند |
| مرن | مراندن | مر | من ئەو مراند |
| چــون | شاندن | چــو | من ئەو شاند |
| بون | •••• | ••• | •• |

دچون و بون دە وەکە هڤالێ خوە ( شاخ )ژێ ڤەناکڤن • دبێنن کۆ ( شاندن ) لشونا ( چاندن ) هاتیە • ( من ئەوشاند ) لشـــونا ( من ئەو چاند ) هاتیە • ژبەرکۆ چاندن توڤکرنا تشـتکیە دبێژن : من تۆڤێ خوە چاند • یانی : من تۆڤێ خوە خستە بن قادێ • ژلەورا ( ش ) لشونا ( چ ) هاتیە •

ـ لێ ژێدەرێ ( بون ) ب ( کرن ) دبي تێپەر • وەك :

| | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| رابــون | ـ | راکرن | ـ | من ئەو راکر |
| خواربون | ـ | خوارکرن | ـ | من ئەو خوارکر |
| سواربون | ـ | سوارکرن | ـ | من ئەو سوارکر |

چاواکۆ کرنا ب ( بو ) ب (کر ) دبي تێپەر : ـفرهاد رابو ـمن فرهاد راکر ••••

## ـ ژێدەر :

جارنا دبي دەستپێکراو وەك :

ـ خوارنا سیرو پیڤازێ نەباشە •

چاوا کۆ جارنا دبي سالۆخ • وەك :

ـ ئەڤ نەتوخوارنە •

ـ دەولەمەندي باشە ••••

ـ کار سەربەستە •••

## آورەك :

ژێدەرێ ـ ب ( ي ) دەرباس‌بویە • لێ (كار) دڤردە وەكو ژێدەرە • یا ناڤێ ژێدەرە • یا ژێدەرێ هشكە ـ هشكە ژێدەرە • ژبەركو ناكڤي بن آوایێ ژێدەر • ژێ‌رە لێكولانەك دورو درێژ گەرەكە ••• ؟

ـ جارنا داخوازا ژێدەر ب ( كرنێ ) تێ گوهراندن • وەك :

ژێدەر ـ نان خوارن بگەرمي نەباشە
كرن ـ بگەرمي نان بخوی نەباشە •••

وەها رەنگە ( كرن ) ژی ب ژێدەر تێ گوهراندن • وەك :

شیرو چایێ تێكەل بخوي چاكە
خوارنا شیرو چایێ تێكەل چاكە •••

## ـ دیسا ژێدەر دو پەرچەیە :

١ ـ هەرێ ـ مثبت •
٢ ـ نا ـ منفی • وەك :
ـ خوارن ـ نەخوارن
ـ هاتن ـ نەهاتن

## ( ١٥ ) ـ كرۆكناف ( اسم الفاعل ) :

## ـ كرۆكناف :

ـ ئەوە كۆ كارەك ـ كرنەك ژێ چێدبي • وەك :

ـ بارام نان خوار • فەرهاد چو شار

دڤردە ـ بارام كرۆكە ـ دەستپێكراوە ژبەركۆ وی نان خواریە وي ئەڤ كار ـ ئەڤ كرن كریە ـ خـــوارنا نان ژوي چێ بویە ـ ژوي دەركەتیە •

ـ فەرهاد دژمنێ خوە کوشت •

فەرهاد کرۆکە ـ دەستپێکراوە • ژبەرکو وی دژمن کوشتیە وي ئەڤ کارکریە •

ـ نان و دژمن پێکراون ژبەرکو کارەك بوان هاتیە کرن :

نان هاتیە خوارن • دژمن هاتیە کوشتن •

ـ ئەڤ دکرنا تێپەر دە ولۆیە • لێ دکرنا تێنەپەر دە پێکراو نەگەرەکە ژبەرکو کرن ژ کرۆك دەرناکڤی • وەك :

ـ بارام چـو •••

ـ چونا بارام نەکتیە سەر کەسەکی دی هەر بوي ڤەمایە ژلەورا دبێژن : تێنەپەر ـ نە دەرباس •

## رەوشا کرۆك :

ـ پر جهێ آخینە کو مرۆڤ دایرۆ دە نکاری ژکرۆكوپێکراورە دروڤەکێ دەینی • ژبەرکو دزمانێ کوردێ دە بـچەند آواتێ خـویا کرن • تشتێ کو هەیە ئەم دکارن بێژن : کرۆك دو پەرچەیە :

١ ـ سادە کرۆك ـ کرۆکێ سادە •

٢ ـ پارچیم کرۆك ـ کرۆکێ پارچیم •

**١ ـ کرۆکي سـادە : ئەوە کو ژیـەك گۆتنێ پیك هاتیە • وەك :**

ـ باش ، چاك ، دز ، خوار ، رازاي ، پالداي •••

**٢ ـ کرۆکي پارچیم : ئەوەکو ژگۆتنکێبیتر هاتیە چیکرن • وەك :**

ـ نانخوەر ، مێرکوژ ، زیڤکەر ، رەنجبەر •••••

: ـ دایرۆ ده ئه‌م کارن ( ئێ ) بکن دروف ژ هه‌ر دوا ره •
: ـ چه‌ده‌ما سه‌ر پێهاتیيه‌ك چێ دبي     وه‌ك :
( کوشتن ) ئه‌م دبێژن :
ـ ئێ هاتیه کوشتن کي‌يه ؟
ـ ئێ ئه‌و کوشتیه کي‌يه ؟

دڤرده : ئه‌م کارن ( ئێ ) بکن دروڤا کرۆك • ( ئێ هات ) بکن دروڤا پێکراو • چه‌ندان نه‌گلك سه‌زایه ژێ ره ، لێ دایرۆ ده ژڤي آوای خوه‌ش‌تر بده‌ستێ مه ناکڤی •

## کرۆك :

ـ دپه‌یڤێ ده هه‌رده‌م ده‌ستپێکراوه         وه‌ك
ـ بارام نان خوار ، فه‌رهاد رازا ، شێرین دلۆرێني
دڤا په‌یڤا ده : بارام ، فه‌رهاد ، شێرین کرۆکن‌ـ ده‌ستپێکراون • ژبه‌رکۆ دپێش ده ده‌ست بوان هاتیه کرن •

## ـ جارنا دکڤی پاش     وه‌ك :

ـ ئێ‌کۆ بارام کوشتیه فه‌رهاده •

دڤرده فه‌رهاد کرۆکه گه‌ره‌که دپێش ده بهاتا ، لێ ژبه‌رکۆ ( ئێ ) شوناوی دپێش ده گرتیه ، دکارن دپاش ده بجي بکن • لێ بآوایێ داخوازێ دپێش ده‌یه :
ـ ئێ‌کۆ بارام کوشتیه فه‌رهاده •     یاني :
ـ فه‌رهاده ئێ‌کۆ بارام کوشتیه •

ـ دهه‌ردو جارا ده کرۆك فه‌رهاده ، ده‌ستپێکراوه •
ئێ‌کۆ بارام کوشتیه سالۆخه •

## ـ كرۆك جارنا ناڤێ سادەیە   وەك :

ـ روستم نان خوار ، زۆرۆ چو ...

## چاوا کوجارنا بەرناڤە .   وەك :

ـ وی نان خوار ، ئەو رازا ...

**دڤردە** ـ : ( وي ـ ئەو ) دو بەرناڤن شونا ناڤ ستاندنە .

## هەروەکو جارنا ئەشکرایە .   وەك :

ـ شێرۆ نان خوار : شێرۆ ئەشکرایە.

## وجارنا نە ئەشکرایە ، نەپەندی‌یە :

ـ نان هات خوارن . نان خوەر نە ئەشـــــکرایە ـ نزانن کیە. نەپەندی‌یە ....

## آورەك :

ئەو ژێدەرێ کۆ ( يي ) بکەڤي داویا وي
کرۆك تێ دە سادەیە .        وەك :

| ژێدەر | تیپا ( ي ) | کرۆکێ سادە |
|---|---|---|
| دزي | ي | دز |
| تولازي | ي | تولاز |
| قەنجی | ي | قەنج |
| باشی | ي | باش |

ـ لێ ئەگەر ( بون ) ، ( کرن ) بکڤن داویا ژێدەر ( ي ) دکڤی

داویا کرۆك          وەك :

| ژیدەر | بون | ژیدەر | کرن | کرۆك | تیپا (ي) |
|---|---|---|---|---|---|
| برچی بون ـ بون | | برچی کرن ـ کرن | | برچی | ي |
| تازی بون ـ بون | | تازی کرن ـ کرن | | تازی | ي |

دیآ پێشی دە ( ي ) هاتیە راکرن • لێ دیا پاش دە وەکە خوەمایە ژبەرکو ( بون ) و ( کرن ) هاتنە آڤێتن و داویا گۆتنێ وەکە خوەمایە•

## ـ کرۆك : دو پەرچەیە :

١ ـ سادە

٢ ـ پەرچیم

### ١ ـ کرۆکێ سادە :

ژ کرنا تێنەپەر چێ دبي          وەك :

| ژیدەر | کرۆك | کرن |
|---|---|---|
| چـوین | چوی | چو ـ چویە |
| ماین | ماي | ما ـ مایە |
| هاتن | هاتي | هات ـ هاتیە |

ـ دڤێ بابەتێ دە ( ي ) شـونا ( ن ) دگري و کرۆك چێدبي •

ـ لێ دشـیوەي سۆری دە ( و ) شونا ( ن ) دستینی    وەك :

| ژیدەر | کرۆك | کرن | •• |
|---|---|---|---|
| مردن | مردو | مرد | ـ مردوە ••• |

| | | | |
|---|---|---|---|
| رزین | رزیو | رزایه | ــ رزایەتەوە ... |
| کەوتن | کەوتو | کەوت | ــ کەوتویەتەوە ... |

ــ یان ژ کۆکا کرنێ چێ دبي و ( ئەر ) تێ داویا وی    وەك :

| کۆکا کرنێ | | کرۆك | آلافا ئەر |
|---|---|---|---|
| فرۆت | ــ فرۆش | فرۆشەر | ئەر |
| چاند | ــ | چینەر | ئەر |

ــ یان تیپا ( ب ) دخن پێشیا کۆکا کرنێ و کرۆك چێ دکن

| کۆکا کرنێ | | کرۆك سادە | تیپا (ب ) |
|---|---|---|---|
| کێش | | بکێش | ب |
| چان | ــ چین | بچین | ب |

## ٢ ــ کرۆکێ پەرچیم

دکرنا تێپەر دە ئەوەکو پێکراو بکڤی پێش و کۆکا ژێـــدەر بکڤی پشت •          وەك :

| ژیدەر | کۆکا ژیدەر | کرۆك پەرچیم |
|---|---|---|
| نان خوارن | خوەر | نان خوەر |
| مێرکوشتن | کوژ | مێر کوژ |
| چغارە کێشان | کێش | چغارە کێش |
| زك ئێشاندن | ائێش | زك ائێش ... |

## :ــ يان بدانينا ڤان آلاڤا پيك تێ

دار ، يار ، كار ، خوەر ، بەر ، ئەر ، كەر ، بەنــد ، مەنــد ، ڤان دۆز چی • وەك :

١ ــ بەيرەقدار ، علمدار ، جاندار ، سەردار ••••
٢ ــ جۆتيار ، هوشيار ، تەيار •••
٣ ــ چۆت كار ، گۆنەكار ، خبات كار ••••
٤ ــ نان خوەر ، بەرتيل خوەر ، گۆشت خوەر •••
٥ ــ رێبەر ، پێش بەر ، دلبەر •••••
س : ٦ ــ پێليخەر ، ژنهينەر •••••
٧ ــ نانكەر ، كاركەر ، خباتكەر ، زيڤكەر •••
٨ سولبەند ، نالبەند ، •••
٩ ــ هنەرمەند ، دەولەمەند ••• •
١٠ ــ دلۆڤان ، شڤان ، كارڤان ، گاڤان ••••

س : ١١ ــ پينەدۆز •••
١٢ ــ پينەچی ، دەرەوچی ، فتنەچی ، بەغچەچی ، قاوەچی •••

## آورك :

دژێدەرێ يائي دە ، كو ب ( آند ) دبي تێپەر ( اين) شونا (آند) د كرۆك دە دستێنی وەك :

| كرنا يائي | ژيدەرێ يائي | كرۆك | ( اين ) |
|---|---|---|---|
| دڤێ وی‌چريا | دەڤ چراندن | دەڤ چرين | ــ اين |
| جلێ وی قەتيا | جلقەتاندن | جل قەتين | ــ اين |
| آشێ وی گەريا | آش گەراندن | آش گەرين | ــ اين |

## : ــ يان بڤان آلاف و تيپين خوار چێ دبي

آ ــ ئه • آر ــ وار          وەك :

| آلاف و تيپ | كرۆك | ژيدەر |
| --- | --- | --- |
| ( آ ) | زانا | زانين |
| ( آ ) | خوەندا | خوندن |

| آلافو تيپ | كرۆك | ژيدەر |
| --- | --- | --- |
| آر | خوار | خەو |
| آر | كەڤنار | كەڤن |
| ئه | پاله | پالەی |
| ئه | خوەره | خوارن |
| وار | خوندەوار | خوندن |
| وار•• | بەندەوار | بەندەكرن |

ژبۆ پربونا كارێ كرۆك ( ئەك ، ئۆك ) بەسەرڤە دكن و دبێژن :

| | | |
| --- | --- | --- |
| اۆك | كەنۆك | كەن |
| اۆك | گەرۆك | گەر |
| ئەك ــ دز | دزەك | دزی |
| | | بچوكێ وی‌یه • |
| ئەك | چلەك | چل |

ژڤان پێتر هەنه كۆ كرۆك چێ‌دكن دور و درێژ نكارم بدم زانين ــ چاوامه بەرێ گــــوتیه پرجهێ آخينــه كۆ ئــەم نكارن آواكی‌یەكانه ــ ڤڤاي ژ كــرۆك و پێكراو ره پــەيداكن • ناچاره مه

( ئی ــ ئی‌کۆ ) ژ کرۆکێ نێر ، ۆ ( آ ــ آکــۆ ) ژ بۆ کــرۆکێ ( مێ ) دانیه • و ( ئێ هات ــ ئێ‌کۆ هات ••• ) ژ بۆ نێرێ ( پێکراو ) ، ( آ ــ آکۆ هات ••) ژ بۆ مێ‌یا ، کرن دروف •

| کرۆك نافێ مێ | کرۆك نافێ نیر |
| --- | --- |
| آمێر کوژ | ئێ مێرکوژ |
| آ خوین خوار | ئێ خوین خوار |

( کوشتی ) و ( گرتی ) نه‌کرۆکن ، به‌لکی پێکراون •

کوشتيێ تیرێ دو چاڤێ ته •••••
گرتيێ زندانم ئه‌ز •••

( کوشتی ) : ــ ئێ‌کۆ هاتیه کوشــتن • ــ کوژراوه •
( گرتی ) : ــ ئێ‌کۆ هاتیه گرتن • ــ گیراوه•

## آواك : کرۆك ژ کرۆك ناف فره‌هه‌تره

یانی چڤا کرۆکناف هه‌یه کــرۆکــه • لێ چڤا کــرۆك هــه‌یه نه‌کرۆکناڤه •

: ــ بارام نان خوار
: ــ وی نان خوار

دڤــرده : ــ ( بارام ) و ( وي ) ناڤو بــــه‌رناڤن کرۆکن ، لێ نه‌کرۆکناڤن

: ــ مێرکوژ ، نان خوه‌ر ، خوین خوه‌ر ••••

دڤرده : ( مێر کوژ ) و ( خوین خوار ) کرۆکناڤن وهم کرۆکن•
ژله‌ورا گه‌ره‌که بێته زانین کۆ دڤێ داباشێ ده داخوازا مه کرۆکناڤه •

* * *

## ( ١٦ ) ــ پیکراو ناف یاناڤي پیکراو : ( اسم المفعول )

: ــ پێکراو ناف : ئەوە کۆ کارەك بوي تێ کرن ئــەوژي دو پەرچەنە :

١ ــ پەندی ــ ئەشکرا

٢ ــ نەپەندی ــ وندا

### ١ ــ پیکراو ناڤێ پەندی ئەوەکۆ ئەشــکەرا بینە خویا کرن . وەك :

ــ بارام نان خوار

ــ شێرین هندور دمالی

دڤردە : ــ ( نان ) و ( هندور ) پێکراون ، ئەشکرانە ــ پەندینە

### ٢ ــ پیکــراو ناڤێ نەپەندی ئــەوە کۆ بخــوە نەپەندیيە ــ نە ئەشکرایە ــ نەدیارە وەك :

ــ بارام لێ خــست .

: ــ وێ چاخێ ( لێ ) راکێش و راکێشراون شونا پێکراو گرتنە دکۆکا خوە دە : ( ل ــ ئێ ) یە . ئێ بەرناڤەکە جهێ پێکراوێ براستی گرتیە . دبي دکۆکا خوە دە :

: ــ بارام ل فەرهاد خست .

: ــ لێ فەرهاد هاتیە راکــرن ژبۆ داخــوازەکێ و ( ئێ ) کــۆ بەرناڤێ خوە پێکرە شونا وی ستاندی‌یە .

## : ــ پیکراو ناڤ چاوا چێ‌دبي ؟

: ــ هەروەکو دەرباس بویــە ، دبي دێرا دە ( ئێــ ئێ‌کــۆ ) وژ بۆ مێ‌یا ( آ ــ آکۆ ) دگەل ڤان چەند گۆتنێ آلیکار بێن : ( هات، هاتیە ، تێ ، بێ )

: ــ وێ چاخێ پێکراو ناڤ پێك تێ وەك :

: ــ ئێ هات کوشتن کی‌یە ؟

: ــ ئێ‌کۆ هات کوشتن کی‌یە ؟

: ــ ئەڤ دکرنا بۆری دە ، لێ دکرنا ناکا دە وەك :

: ــ ئێ تێ کوشتن کی‌یە ؟ ئێ‌کۆ تێ کوشتن کی‌یە ؟

## دکرنا هیتێ دە :

ئێ بێ کوشتن کی‌یە ؟ ئێ‌کۆ بێ کوشتن کی‌یە ؟

## : ــ دەمیادە : ــ دکرنا بوری دە :

ــ آهات کوشتن کي‌یە ؟ آکۆ هات کوشتن کي‌یە ؟

## دکرنا ناکا دە :

ــ آتێ کوشتن کی‌یە ؟ آکۆ تێ کوشتن کی‌یە ؟

## دکرنا هیتێ دە

ــ آبێ کوشتن کي‌یە ؟ آکۆ بێ کوشتن کي‌یە ؟

## : ــ دشيوەێ سۆرى دە :

آلاڤا ( راو ) دروڤ و نيشانا پێكراو ناڤە :        وەك :

: ــ كوژراو ، خوراو ، دراو ، فروشراو ....

دڤردە : سۆراني ژ كورمانجي سڤك ترە .

* * *

## ( ١٧ ) ــ ركناڤ :      ( الاسماء المتضادە ):

### : ــ ركناڤ :

ئەوەكۆ دو ناڤ ركێ هەڤ ونابي شونا هەڤ بگرن     وەك :

كەسكو سۆر ، سۆرو سپي ، ترشو تال ، هشكو نەرم ، كنو درێژ ، كەروكۆر ، زراڤ و ستور ، قەنجو پيس ، شۆر و شێرين ....

ژڤا ناڤارە تێ گۆتن ( ركناڤ ) . ژبەركۆ ركێ هەڤ و نابي يەك شونا يكى بگرى هەر وەكو ئەم نكارن ژ شێرين رە بێژن : شۆرە ، ژكن رە نكارن بێژن : درێژ ، ژ ستورو قالن رە نكارن بێژن : زراڤە .

* * *

## ( ١٨ ) ـ جيوى ناڤ ( مرادف ) :

ـ ناڤێ جێوى ئەوە كۆ دو ناڤ سەربخوە ژبۆ داخــوازەكێ هاتبن وەك :

ـ مور ـ گێرك • چێلەك ـ مانگا • مي ـ مەر ، رەڤ ـ بــەز
ـ هەردو ناڤ داخوازەكێ ددن زانين • دەما دبێژن : ( مورى ) داخـــواز ژ گـــێركێ چىـيـــە تێ زانين • هەروەهـــا دەما دبێژن : ـ ( گێرك ) داخواز ژ مورىێ چەيە تێ زانين •
ئەو ناڤێ ( جێوى ) دزمانێ كوردى دە هنگى پردبن چــە دەما شيوەێن كوردى هەمو د ( قاموس ) و ( رێ زمانێ ) مە دە گهانەهڤە لێ هەر شيوەيەك سەربخوە دبي دايرو دە دەست تەنگ بي •



## ( ١٩ )ـ ژبەرناڤ ( بدل )

### ژبەرناڤ :

ئەوە كۆ دوناڤ لپەى هــەڤ تێن ، وئــەم كارن يكــى باڤێژن وداخواز وەكە خوە بمێني وەك :
ـ كورێ سۆرۆ ئێكۆ كەتيە زندانێ بارامە نەفەرهادە •
ـ كورێ سۆرۆ ئێكۆ كەتيە زندانێ نەفەرهادە بارامە •
ـ دهەردوا دە ئەم كارن ( نەفەرهادە ) باڤێژن وداخواز وەكــە خوە دمێني :
ـ كورێ بوزۆ ئێكۆ كەتيە زندانێ بارامە •
: ـ دهەردوا دە ئێ تيپا ماندەلا دگەل بێ تێ آڤێتن ، ژبەركــۆ بشاشي هاتيە سەر زمانێ دەنگبێژ •

لێ جارنا گۆتنا ( وی ) دکفی ناف هەردو ناڤا • وێ چاخێ ئــەم کارن تم ئێ پێشي باڤێژن • ژبەرکو بشاشي هاتیە گۆتن •
: ــ ئەف بارامە ؟ وی شێرۆیە ؟ وێ چاخێ بارامەو ( وی ) تێنە راکرن • ئەم کارن بێژن : ئەف شێرۆیە ؟

لێ پرێ جارا ئێکو بشاشي تێسەر زمانێدەنگبێژ بتیپا ماندەلا پوچ دبي وەك :

: ــ کەچاکۆتو دخوازی شێرینە نەگولنازە
: ــ کەچاکۆتو دخوازی نە گولنازە شێرینە •
گایێ کۆتو دبێژی رەشبەلەکە ، نە سۆربەلەکە •
گایێ کۆتو دبێژی نەسۆربەلەکە ؛ رەش بەلەکە ••••

* * *

## ( ٢٠ ) ــ ڤەبژار ــ تەمیز :

ناڤێ ڤەبژار هەردەم لپەي ناڤێ ژمارتێ • ددما ئەم دبێژن : چار مرۆف هاتن مالا مە •
ــ ( چار ) ژمارناڤەکە داخوازا وي بێ پیڤان و نەئەشکرایە •
: ــ دبي چار پەزبن، دبي چارگابن، دبي چار سوار بن، دبي•••
لێ دەما مەگۆ مرۆف ژناف وان داخوازا تەڤا هاتە ڤــەبژارتنو داخواز ئەشکرابو کۆ ئەو چار مرۆڤن نەتەبا و تشتن •••
: ــ ایرۆ من دوازدە گور کوشتن •
دڤردە : ــ دوازدە ژمارناڤەکــە ، داخـــــوازا وی گلك فرەھ ونە ئەشــکرایە ••

: ــ دبي مرۆف بن ، دبي هرچبن ، دبي کۆڤیبن •••
لێ کۆ ئەم دبێژن : دوازدە ( گو[illegible] ) ژناف وان داخوازان ( گور ) هاتنە ڤەبژارتن وداخواز ئەشکرابو

❋

## ( ٢١ ) ـ ناڤـو دەنگ : ( الشهرة )

: ـ ناڤو دەنگ، ئەوە کو ژبەر ناڤێ راستی ڤە تێ گۆتن وەك :
گۆران ، بێ‌کەس ، هەژار ، پیرەمەرد ...
ـ هەریەك ژڤا ناڤا شونا ناڤێ براستی گرتی‌یە ، ودوەلێت دەنگ دایە . ناڤێ براستي دبەرڤا ناڤا دە وندا بونە ، بەلکي أو بخـوە ژی دەما بناڤێ راستی دەي لێ کي ، خوە ناس نەکي .

### ـ ئەوژی :

١ ـ یان پەسنە : هەژار ، بێ‌کەس ، کوردی ....
٢ ـ یان باڤو کچە : باڤێ سەمیرۆ ، باڤ فەخرۆ ....
٣ ـ یان باڤو کورە : باڤێ بەهجەت ، باڤێ علی ...
٤ ـ یان کورو باڤە : بشارێ چەتۆ ، حەسنێ موسـی ، علیکێ بەتێ ....
٥ ـ یان کورودی‌یە عەمێ گۆزێ حسنێ بێزکێ ...
٦ ـ یا براو خوشکە کەکێ گەورێ ...

*　*　*

## ( ٢٢ ) ـ رەوش　( حال ) :

: ـ رەوش ئەو ناڤە کو رەوشا مرۆڤەکی، یا تەبا کی، یان تشتکی بدی زانین :　وەك :
ـ بارام بە سواری هاتە کوشتن .
ـ من سێڤ نەگهاي خوار
ـ گور بلۆق دبەزی
: ـ دڤان هەرسێ پەیڤا دە ( بسواری ) و ( نەگهاي ) و ( بلۆق ) رەوشن ژبۆ کوشتنا بارام و خوارنا سێڤێو بەزا گور .

چاوا دەرباسی بویە ( ئێ ) ژبۆ نێر و ( آ ) ژبۆ مێیە •
: ــ گەرەکە ئەم زانبن کۆ ئەڤ هەردو آلاڤ دپەسن دە تێن لێ
درەوش دە ناین     وەك :

پەسن ــ بارام ئێ مێر هات کوشتن
رەوش ــ بارام مێر هات کوشتن
پەسن ــ رەوشا سەربەست هاتە مال
رەوش ــ رەوشێ سەربەست هاتە مال •• •

* * *

## ( ٢٣ ) ــ بالڤدان : ( النسبة )

: ــ بالڤدان ئەوە کو مرۆڤ تشتکی بدی ببال تشتکی ڤە •

**ئەوژی چەند پەرچەنە :**

١ ــ یا ب ( یی ) تێ چێکرن     وەك :
ــ خاني ، جزیري ، کویي ، شارەزوري •••
٢ ــ یا بچي وڤان تێ چێکرن •   وەك :
ــ پینەچی ، قاوەچی سەختەچی ، دەرەوچی ••••
ــ بەغچەڤان ، دەرگەڤان ، پالەڤان •• •
٣ ــ یان تیپا دوەم دو جار دبي •    وەك :
ــ قەززاز ، خررات ، قەللاش• دکوردي دە گلك کێمە •
٤ ــ یان ( دار ) تێ داوی یا وی     وەك :
ــ دکاندار ، خەزنەدار ••••
لێ دڤردە : ( دار ) بداخوازا خوە دیە •••

# ( ٢٤ ) ــ ناڤێ نیشاندان ( اسم الاشاره )

: ــ نیشـاندان ، ئەوەکـــۆ مرۆڤ دکاری بوی مروڤ یا تەبا ، یا تشت نیشان بدی • ئەوژی دو پەرچەیە :

## ١ ــ یەك دکرنا بۆری تێپەر دە
## ٢ ــ دهەمو کرنێ مای دە

دکرنا بۆری تێپەر دە ٦ شەش ناڤێ نیشـاندان هەنە کۆ ئەم دکارن بکاربینن :

ڤێ ــ ژبۆیەکە مێ بەرچاڤ نێزیکە : ــ ڤێ خواری‌یە
وێ ــ ژبۆیەکە مێ دوری‌چاڤ یاوندا : ــوێ خواریە
ڤي ــ ژبۆیەکی نێر بەر چاڤ نێزیکە : ــ ڤي خواریە
وي ــ ژبۆیەکی دوری چاڤ یاوندایە : ــ وی خواریە
ڤا ــ ژبۆکـۆما نێرومێي نێزیكو بەر چاڤە : ــ ڤا خواری‌یە •
وا ــ ژبۆکۆما نێرو مێي دوری چاڤ یاوندا : ــ وا خواری‌یە •

: ــ جارنا ( ها ) ، ژبۆ دوری دکڤی داویا ڤا ناڤا • وتێ گۆتن :

نێر ــ ڤي خواری‌یە ڤینێ ها خواریە •
•• ــ وی خواری‌یە وینێ ها خواری‌یە •
مێ ــ ڤێ خواری‌یە ڤێنا ها خواری‌یە •
•• ــ وێ خواری‌یە وێنا ها خواری‌یە •
کۆم ــ ڤا خواری‌یە ڤانێ ها خواری‌یە •
•• ــ وا خواری‌یە وانێ ها خواری‌یە •

: ــ جارنا ( نا ) ژبۆ دوري دکەڤی پاشی ( ها ) • وەك :

**نیز مێ :**

: ــ ڤێ خوار ڤێنا خوار ڤێنا ها خوار ڤێنا هانا خوار

**دور مێ :**

: ــ وێ خوار وێنا خوار وێنا ها خوار وێنا هاناخوار

**نیز نیر :**

: ــ ڤي خوار ڤینا خوار ڤینێ ها خوار ڤینێ ها نا خوار

**دور نیر :**

: ــ وی خوار وینا خوار وینێها خوار وینێهاناخوار

**کۆم نیز :**

: ــ ڤا خوار ڤانا خوار ڤانێ ها خوار ڤانێ هاناخوار

**کۆم دور :**

: ــ وا خوار وانا خوار وانێ ها خوار وانێ هاناخوار

**دکرنا هینتی و ناکا تێپەر و کرنێ تێنەپەر دە ٢ دو ناڤ هەنە : ( ئەڤ ــ ئەو ) .**

**ــ دکرنا تێپەر دە**

| هێ تێ | ناکا | | بۆری |
|---|---|---|---|
| ئەڤ دێ بخوی | ئەڤ دخوی | ڤي خوار | نێر نێز : |
| ئەڤ دێ بخوي | ئەڤ دخوی | ڤێ خوار | مێ نێز : |
| ئەو دێ بخوي | ئەو دخوي | وي خوار | نێر دور : |
| ئەو دێ بخوي | ئەو دخوي | وێ خوار | مێ دور : |

كۆم تێز : قاخوار ئه ڤدخون ئه ڤدێبخون
كۆم دور : واخوار ئەو دخون ئەو دێبخون
: ــ هەروها (ها) و (هانا) ژ بۆ دوري دكڤن داويا وان

## كرناناكا :

| | | |
|---|---|---|
| ــ ئەڤ دخوي | ئەڤێ ها دخوي | ئەڤێ هانا دخوي |
| ــ ئەو دخوي | ئەوێ ها دخوي | ئەوێ هانا دخوي |
| ــ ئەڤ دخون | ئەڤێ ها دخون | ئەڤێ هانا دخون |
| ــ ئەو دخون | ئەوێ ها دخون | ئەوێ هانا دخون .. |

## كرنا هێ تێ تێپەر :

| | | |
|---|---|---|
| ئەڤ دێ بخوی | ئەڤێ ها دێ بخوی | ئەڤێ هانادێبخوی |
| ئەو دێبخوی | ئەوێ هادێ بخوي | ئەوێهانا دێ بخوي |
| ئەڤ دێ بخون | ئەڤێ ها دێ بخون | ئەڤێهانا دێبخون |
| ئەودێ بخون | ئەوێ ها دێ بخون | ئەوێ هانادێبخون |

## كرنا بۆری تێنەپەر :

| | | |
|---|---|---|
| ئەڤ چــو | ئەڤێ ها چــو | ئەڤێ هانا چــو |
| ئەو چــو | ئەوێ ها چــو | ئەوێ هانا چــو |
| ئەڤ چــون | ئەڤێ ها چون | ئەڤێ هانا چون |
| ئەو چــون | ئەوێ ها چــون | ئەوێ هانا چون .. |

## كرناناكا تێنەپەر :

| | | |
|---|---|---|
| ئەڤ دچی | ئەڤێ ها دچی | ئەڤێ هانا دچی |
| ئەو دچی | ئەوێ ها دچی | ئەوێ هانا دچی |
| ئەڤ دچن | ئەڤێ ها دچن | ئەڤێ هانا دچن |
| ئەو دچن | ئەوێ ها دچن | ئەوێ هانا دچن ... |

## کرنا هێتی تێنەپەر :

| | | |
|---|---|---|
| ئەڤ دێ بچی | ئەڤێ ها دێ بچي | ئەڤێ هانا دێ بچی |
| ئەو دێ بچی | ئەوێ ها دێ بچی | ئەوێ هانا دێبچی |
| ئەڤ دێ بچن | ئەڤێ ها دێ بچن | ئەڤێ هانا دێ بچن |
| ئەوێ بچن | ئەوێ ها دێ بچن | ئەوێ هانا دێ بچن |

## ژبۆ بجیکرن جارنا ( ها ) دکڤی پیشیا پەیڤێ وەك :

| | | |
|---|---|---|
| هاڤي گۆتیە | هاڤینا گۆتیە | هاڤینێ ها ••••• |
| هاڤێ گۆتیە | هاڤێنا گۆتیە | هاڤێنا ها ••••• |
| هاوی گۆتیە | هاوینا گۆتیە | هاوینێ ها •••• |
| هاوێ گۆتیە | هاوێنا گۆتیە | هاوێنا ها •••• |

: ــ ۱ ــ ژمە زە خویا بو کۆ (ئەڤ)و(ئەو)دنێرو مێ دە، دکۆمو ئەك دە ، وەکە خوە مان ونە هاتنە گوهەراندن •

: ــ ۲ ــ چاوا کۆ : ( ئەو ) و (وي ) و ( وێ ) و ( وا ) دناڤ بەرناڤ دە ژی تێن ، و ژبەرناڤا تێنە ژمارتن • ژ لەورا هــن زمان زانێ کورد ناڤێ نیشاندان تەڤا ژبەرناڤا دژمێرن ؤ دبێژن:(بەرناڤێ اشاري)

## آورمك :

دشیوەێ سۆری دە ( ئەم ــ ئەمە ــ ئەمان ) لشونا ( ئەڤ ــئەڤە ئەڤان ) تێن • چاوا کۆ دکورمانجی دە ( ئي ) و دســۆراني دە ( ئیم ) ئەڤن جیا دە تێن • وەك :

( ایرۆ ــ ایمرۆ ــ ئەڤرۆ )•

| | | |
|---|---|---|
| : ــ کورمانجی | اي ــ رۆ | بارام چــو باژێر • |
| : ــ بەهدیني | ئەڤ ــ رۆ | بارام چــو بازار • |
| : ــ سۆرانی | ایم ــ رۆ | بارام رەوشت بۆشار |

**ـ هەروەها : گلك جاران ( ئە ) دكەڤی پیشیا ناڤێ نیشاندان وەك :**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نێر | ـ | ڤي نان خواریيە | ـ | ئەڤي نان خواریيە |
| مێ | ـ | ڤێ نان خواریيە | ـ | ئەڤێ نان خواریيە |
| كۆم | ـ | ڤا نان خواریيە | ـ | ئەڤا نانخواریيە |
| نێر | ـ | وي نان خواریيە | ـ | ئەوي نانخواریيە |
| مێ | ـ | وێ نان خواریيە | ـ | ئەوێ نانخواریيە |
| كۆم | ـ | وانان خواریيە | ـ | ئەوا نان خواریيە |

لێ براستی دكورمانجی دە گلك كێم بويە ، يا نەمايە . دڤیساندنێ دە ئەڤ تیپێ زێدە گەرەكە هەمی بێنە آڤێتن دا كۆ گراني دزمانێ مە دە بجارەك نەمێني .

ل شونا كۆ دو جار زمانێ بگەری ( ئە ـ وا ) باجارەك بگەری ( وا ) خوەشترو سڤك ترە . ژلەورا كورمانجا بگر بجارەك راكرنە . لێ دسۆراني دە هێ لبەرخوە ددي .



## (٢٥) ـ پرسیاری (الاستفهام):

:ـ دزمانی مه ده پرسیاری بدو آواتێ:
١ ـ بێ آلاف
٢ ـ بآلاف

### ١ ـ بێ آلاف :ـ خورینا دەنگ دکەڤي داویا پەیڤێ ـ پرسێ و (؟) ڤێ نیشانێ دپاش ده دنفیسن وەك :

: هرمز لماله ؟ فرهاد نەچویه باژێر ؟
:ـ شێرین دانه مێر ؟ هی شێرین مێر نەکریه ؟
:ـ لسەر چەم پر آڤا کرنه ؟
:ـ خوەندەگه لگوندێ وه هەیه ؟

### ٢ ـ بآلاف :

ـ ئەوەکو یەك ژڤا آلاڤێ خوارێ پێره بێ :
ـ کی ، کەی ـ کەنگی ، کا ـ کوا ، کو ، کیژان ـ کامه ، قەی خوەنه ، خەمۆ ، چه ، چاوا ، چلۆ ، لۆ ، بۆ ، چەند ، چڤا ، گەلۆ ، آیا چـون .... وەك :
(کي) ـ ژبو مرۆڤایه ـ دبێژن ئەڤ کيیه ؟ ئەو کيیه ؟
(کەنگی ـ کـەی) ـ ژبۆ دەمه . کـورمانج دبێژن :ـ بارام کەنگی تێ ؟ بسۆرانی . بارام کەی تێ .
(کا ـ کوا) ـ لهەولێرێ ژبۆ پرسـکرنا تشـتکی ـ کەسێ دگۆمێ ده تێ :ـ کا بارام ؟ کوا بارام ؟
(کو) ـ لهەولێرێ ژبۆ پرسـکرنا رنگو رەوشـا مرۆڤو هەرتشتیه ؟ بارام کویه ؟

( خانى ) دبێژى : ( ئەم كو سانن ) ؟ ــ ئەم چلونە ؟ ــ لێ ل گَلك دەرا دبێژن

:ــ بارام ل ( كو ) يە ؟ ژبۆ جي‌يە •

( كيژان ــ كام ) ــ ژبۆ ڤەبژارتنە : ــ بارام كيژانـــە ؟ ــ بارام كامەيە ؟ هەروەكو بارام دناڤ چـەند مرۆڤا دەيە ، دخـوازى ژوانــ ڤەبژێرى ••• و ناس بكي •

( ڤەى ) ــ دكورمانجى دە ، ژبۆ پرسكرنە : ڤەى بارام چـويە ؟ بۆچى بارام روەشتوە ؟

: ــ لێ دســـــۆرانى دە : ( ڤەى ) ناكى ــ غم ناكى • يانى ئەڤ كارێ تە پرسيارى ناخوازى •

( خوەنە ــ خەمو ) : ــ دەبەرە هەري ! خوەنە ژپشـتا باڤێ‌م‌نە ؟ دبێژن : ــ خەمۆ ژپشتا باڤێ م نە ؟ عەربێ ناڤ كوردا ولۆدبێژن ( چە ) ــ ژبۆ پرسكرنا ژتشتە ــ ژبل مرۆڤان : ئەڤ چەيە ؟ ئەڤ چەتشتە ؟ ئەڤ چەتەبايە ؟جارنا دبێژن:ــئەڤ چەكەسە؟ئەڤ چەمرۆڤە؟ لێ دغەيدێ دە دبێژن • هـــەر وەكـــو وى ژ مرۆڤا ناژمێرن • ئەگـــەر مرۆڤەك لدەري بدى ئەم دبێژن : ــئەوەكي‌يە ؟ وێ چاخێ داخوازامە مرۆڤە ، لێ كۆ ئەم بێژن : ئەوچەيە ؟ وێ چاخێ داخوازا مە تشـــكەــ تباكە ••••

(چاوا) ــ ژبۆ پرسكرنا ژرەوش‌و رەنگە :ــفرهاد چاوايە ؟ يانى رەوشا وى بچە آواي ــ بچە رەنگى‌يە ؟ ( چاوا ) پەرچيمێ : ( چە ــ آوا ) يە

بارام چاوايە ؟ يانى بچە آواي يە ؟

( چلۆ ) ــ ژبۆ پرســكرنا ژ ( لەون ) و رەنگە ، دو پەرچــەیە :
( چە ــ لون ) ژكوردی و عەربي هاتیــە هڤ : بارام چلــویە ؟ یاني
( لەونێ ) وی ــ رەنگێ وی چەیە ؟

( بۆ ــ لۆ ) ــ ژبۆسەبۆنی هــاتنە : ــ ئەتو لۆوا دكی ؟ ئــەتو
بۆ وادكي ؟ یاني چما ولۆ دكی ؟ لجەم سۆرا ولۆیــە • لێ كــورمانج
( لۆ ) نابێژن :

( چەند ) ــ ژبۆ ژمارە • دخوازی ژامارا داخوازا خوە بزانی :
چەند مرۆڤ هاتن ؟
چەند تڤنگێ وە هەنە ؟ چەند مرۆڤێ تە هەنە ؟

( چقا ) ژبۆ ژمارە ، وەكە ( چەندە ) لێ ( چقا ) دو پەرچەیە :
( چە ــ قاس ) چە ــ قدر •دبي یا پاشي ژ عربي هاتبي • چقا پەزێ وە
هەیە ؟ چە قاس پەزێ وە هەیە ؟ چە قیاس ــ چە قدر ••

( گەلۆ ) ــ ژبۆ پرسـكرنا تەڤابي هاتیە : گەلۆ شێرین لمالــە ؟
گەلۆ بارام ژ زندانێ دركـیە ؟

( آیا ) ــ وەكە ( گەلۆ ) تڤایـیە : آیا بارام ژ خــــوندە گەهێ
دەرچویە ؟ ( خانی ) دبێژی :

اد بارامە وێ گها كمالێ آیا بووە قابلێ زەوالێ ؟

( چــۆن ــ ) وەكە ( چاوا ) و چلۆنە : ( چۆن ) سۆرانیـیە

( چەتۆن ــ ) ( چتۆن ) كورد داغی دبێژن • ( تۆن ) رەنگ‌وتوز
و آوایە •



# (٢٦) ـ بيتر ناف (تفضيل):

## بيتر ناف:

ئەوە كۆ ئێ پێشي ژ ئێ پاشي بێتر يا كێم تر بي •

## ١ ـ بيتر

ـ روستم ژ گوهدەرز بناف ترە • بارام ژ فەرهاد چێترە •
شێرين ژ نەسرين ژير ترە • شكر ژ دوشاو خوەش ترە •
خانيێ مە ژ ئێوە بلند ترە •••

## ٢ ـ كيم تر

ـ گر ژ چيا نزم ترە • چار ژ پێنجا كێم ترە • گوند ژ باژار
بچوك ترە •• سير ژ پيفازێ نەخوەش ترە •
بن دەستى ژ مرنێ پيس ترە •••

## آورەك

درەوشا هەرتشتى دە سێ پەرچە هەنە : ( باش ـ پاك ـ پيس )
دسەر باش رە باش تر هەيە ، دسەر پاك رە پاكتر هەيە • لێ
دسەر پيس رە تشتك نينە بەلكى دبن پيس رە ( پيس تر ) هەيە •
بدوف هەڤدە : ـ باشتر ـ باش ـ پاكتر ـ پاك ـ پيس ـ
پيستر •

## قەنج:

شونا باش دگري و ( چاك ) شونا ( پاك ) دستێنى • دەما ئـەم

دبێژن ــ بارام چاکه ــ پاکه • یانی نەباشه و نه پیسه •

ــ لێ دەما دبێژن : ــ بارام ژ فرهاد چاك تره ــ پاكتره • یانی فرهاد ژی نه پیسه • لێ بارام بێتر چاکه ــ پاکه • لێ دەما ئەم دبێژن : فرهاد ژ بارام باشــــتره یانی بارام ژی باشه ، لێ فرهــاد باش‌تره بێتر باشه •

ــ لێ کــو ئەم بێژن : ــ بارام ژ فرهــاد پیس‌تره • یانی فرهاد ژی پیســه لێ بارام بجارەك پیســه •

: ــ خوەشی ــ خوەش‌تر ــ خوەش‌ ــ پاکتر ــ پاك ــ نەخوەش نەخوەشـتر •      دڤردە :

نەخوەش ــ نەخوەش‌تر لشونا پیس‌و پیس‌تر هاتنەژ بۆ کــۆ گۆتنا پیس نەبۆ غەیدبی نایێ گۆتن خەسما دتشتێ خوار نێدە • ژبۆ تۆره نایێ گۆتن • تەنێ جارنا گوندی ، یا مرۆڤێ نەخوندی ــ نەزان ــ بێ تۆره دبێژن : ئەڤ خوارنا پیس چەیه ؟ ئەڤ سێڤێ پیســـ ، ئەڤ گۆشتێ پیس ••• لێ بآوای تۆره نه راسته ــ نه باشه ••

: ــ دڤر هاته خویا کرن کو ( تر ) آلاڤا بێتر ناڤه •



## ( ٢٧ ) ـ ناڤێ دیتنی و نه دیتنی   ( مادی ومعنوی )

## ـ دیسا ناف دبي دو پەرچە

**١ ـ ناڤێ دیتنی ـ پەندی بەرچاڤ ـ ( مادی ).**

**٢ ـ ناڤی نەدیتنی ـ نەپەندی ـ ( معنوی ) .**

### ١ ـ ناڤێ پەندی دیاری چاڤ

ئەوە کو بخوە لاشەك بي وبێ گرتن و دیتن       وەك :

ـ شور ، خەنجر ، تفنگ ، نان ، دار ، بەر ...

### ٢ ـ ناڤێ نەپەندی ـ داخوازی :

ئەودکو نەپەندیو نە دیاری چاڤە . نکارن بگرنو ببێنن وەك :

ـ ساویر ، سرشت ، پەری ، خوەشـــي ، باوەري هێڤی ...

براتي ، هەڤالتي ، دۆستاني گراني ، خورتي ، خۆرتي ، جواني

تەڤین ، پەڤین ، رەڤین ، گور مین ، خومین ، نالین ڤێرین ....

س : تەڤە گورمە .... سەرما گەرما



## (٢٨) ــ دەڤ خواری (الايمالة)

: ــ دهەمو زمانا دەدەڤ خواری هەیە، لێ براستی دەڤخواری دزمانا دە کێما سی یە کەمەزنە • د ( قرآنێ ) دە ٧ حەفت شیوە هەبون لێ ایرۆ دزمانێ عربي دە نسایە ، یا گلك کێم بویە • پرجهێ آخینە کو دزمانێ مەدە گلك دەڤ خواری هەیە • هەتا خــوندەوارێ مــەژی بدەڤ خواری دپەیڤن ، وجهێ پایەداری ژ خوە رە دبێنن • چە دەما دبێژن : خوین ــ خۆین • موی سی ، اوي سڤ •

ل ناڤ بەهدینا و سۆرا و بۆتا و هەکاریا دەڤ خواری گلكهەیە ژ موسا رە دبێژن : ــ موي سا • ژ ( کۆر ) رە دبێژن ( کویێر ) ژشون رە دبێژن : ــ شــوێن • ژکــوە رە دبێژن : ( لکچێو ) دخوازن بزۆر ( لك چە ێو ) ڤاتیپا بەهەڤرە ژ دەڤێ خوە دەرخن •

: ــ کورمانج ژ ( خون ) رە دبێژن :ــخوین• وسۆرا دبێژن :ــ خۆین • بآورما من گەرەکە کورد هەمو خەسما خوندەوار ڤێ دەڤ خوارییێ ژ زمانێ خوە راکن • و دڤیــارێ خوە دە نەڤیــــــن • لسلیمانييێ دخوازن ، ( دوازدە ) بکن ( دوان گزدە ) ــ لێ نزانم چاوا ژ دەڤێ خوە دەر دخن • بخوە ژی نکارن ژێ رە چارە ببێنن •

## ( ٢٩ ) ـ پەرگالا ناف : ( وضع الاسم )

: ـ دکوردي ده ژبۆ نێرا ( ٥ ) رەوش تێنه سەر ناف • ئەگەر داویا ناف گرێداي بي • وەك ( نان ) :

١ ـ ئەف ( نان ) خوەشه ـ گرێداي •
٢ ـ ئەف چه ( نانه ) ؟ ـ تەڤگەرا ( ئه )
٣ ـ( نانێ ) مه ایرۆ خوەشه ـ تەڤگەرا ( ئێ )
٤ـ ڤي ( نانی ) بخوه ـ تەڤگەرا ( ئي )
٥ ـ ( نانۆ ) قربانۆ ـ تەڤگەرا ( ۆ )

## ـ بارام :

١ ـ ( بارام ) نان دخوی • بێ تەڤگره ـ گرێدای‌مایه
٢ ـ ( بارامه ) نان دخوی • تەڤگرا ـ ( ئه )
٣ ـ ( بارامێ ) مه نان دخوی • تەڤگرا ـ ( ئێ )
٤ ـ ڤي ( بارامي ) نان خواری‌یه ؟ تەڤگرا ـ ( ي )
٥ ـ هەی ( بارامۆ ) ! قربانۆ ! تەڤگرا ـ ( ۆ )

## ژبۆ مێیا چار رەوش هەنه : وەك :

( سێڤ )

١ ـ ئەف سێڤ گلك خوەشه • گریداي
٢ ـ ئەڤ چه سێڤه • تەڤگرا ـ ئه ـ
٣ ـ ڤێ سێڤێ بخوه • تەڤگرا ( ئێ )
٤ ـ سێڤا ته گلك خوەشه • تەڤگرا ( آ )

## ـ دلشا :

## ـ ئێ ئەگەر داوی‌یا وی تیپەك دەنگي بي سێ رەوش ژێ رە هەنە :

١ ـ دلشا هاتە مال ( آ )

٢ ـ ئەڤ دلشایە هاتە مال ( یە )

٣ ـ ڤێ دلشاێ مالا مە وێران‌کر ـ ( ئێ )

## گللك جارا ( آ ) ب ( ئێ ) تێ گوهەرتن وەك :

ـ آش ، آگر ، آرد ، آلف آسن ، آخور ...

ـ قاتر ، گارس ، دار ، بار ، کار ، مار ...

## : ـ دبیژن :

ـ چوم أێش ، ژ اێش هاتم ، مە بارێ خوە لاێش کر ـ آ ئێ
ـ کتیە أێگر ، دأێگردە سۆتا ، اێگر ڤێخە ـ آ ـ ئێ
ـ اێرد بدە بەر هەڤیرێ خوە ..... ـ آ ـ ئێ
ـ اێمێ هەسپێ بخە اێلف ، اێلف پاڤژکە ـ آ ـ ئێ
ـ بهێـن ـ لێخە ..... ـ آ ـ ئێ
ـ دەوارا بخە اێخور ... ـ آ ـ ئێ
ـ تە اێمێ ڤێتر دانیە ؟ ڤێتر بەردە ...
ـ گێرس بکوتە ، گێرس بچینە ، گێرس بخوە ...
ـ بدێر لێخە ، دەست بدە دێر ...
ـ بارام بکێر نائێ ، بارام بێ کێرە ...

ـ دژمن وه‌که سه‌رێ مێر ب‌په‌رچقێنه ...
دهه‌موا ده ( آ ) ب ( ێ ) هاتیه گوراندن . نفشێ پێشي ( آ ) دپێش ده‌یه . لێ نفشێ پاشي ( آ ) دنێڤی ده‌یه ...
: ـ لێ هنك زمان زان هه‌نه کۆ دبێژن : ئه‌و ته‌ڤگرا داویا ناف کرنا آلیکاره . لێ ب‌آورا من نه‌راسته . دبي ب‌کرنا ( بو ) هاتبن خاپاندن . راسته چه‌کرنێ کۆ ژ ( بون ) ده‌رکڤن آلیکارن وه‌ك :
ـ خوار ( بویه ) ـ بویه ـ آلیکاره لێنه ( یه ) آلیکاره به‌لکی ( بو ) ته‌نی آلیکاره . و ( یه ) ته‌ڤکره . دکۆکا خوه‌ده :
( بو ـ ه ) ژ به‌رکۆ دو تیپێ بده‌نگ بهه‌ڤره کۆم نابن ( یه ) خستنه ناف وان .

---

## ( ٣٠ ) ـ به‌رناف ( الضمائر ) :

### : ـ به‌رناف

ـ ئه‌وه کۆ شونا ناف دگری ـ ژبه‌ر ناف ڤه تێ گۆتن . وه‌ك :
: ـ بارام نان خوار ـ وي نان خوار
: ـ شێرین ده‌یدکێ دهژێني ـ ئه‌و ده‌یدکێ دهژێني..
: ـ ( وی ) کۆ به‌رناڤه شونا بارام گرتیه . و ( ئه‌و ) شونا شێرین ستاندی‌یه به‌رناڤه ـ ژبه‌رڤه هاتیه گۆتن .. .

## : ـ به‌رناف ـ دکورمانجی‌ده دوبیشن :

١ ـ به‌رناڤێ کرنا بۆری تێ‌په‌ر
٢ ـ به‌رناڤێ هه‌می کرنێ مایي .

**١ ــ بەرناڤێ کرنا بوري تێپەر ٧ حفت پەرچەنە :**
**چار شونا تەکناف دگرن ( من تەوي وێ )   وەك :**

١ ــ من نان خواری‌یە •
٢ ــ تە نان خواری‌یە •
٣ ــ وي نان خواریي‌یە •
٤ ــ وێ نان خواری‌یە ••••

**:ــ ۋ ٣ سێ شونا کۆم ناف دگرن :   وەك :**

١ ــ مە نان خواری‌یە
٢ ــ وە نان خواری‌یە
٣ ــ وا نان خواری‌یە •••

**آورەك :**

گلك جاران ( من ) دبي ( م ) ــ ( ن ) تێراگرن ــ تێآڤێتن‌و تێگۆتن لشونا

: ــ من نان خوار   ــ   م نان خوار •

هەروەکو ( تە ) بچەند پەرگالا تێ وەك :

ــ تە نان خوار ــ تێ خواریي‌یە •تي دخوي • توا دخوي ــ تويا دخوي •••• ( تە تێ تي تو ) •

: ــ ( وي ــوێ) • ــ جارنا (ئە) تێ سەر ڤان هردوا وتێگۆتن:

: ــ وي خواریي‌یە   ــ   ئەوي خواری‌یە •
: ــ وێ خواری‌یە   ــ   ئەوێ خواری‌یە •

: ـ ( وا ) دکۆمێ ده جارنا تێ گۆتن : ئەوا خواری‌یە • لشونا: وا خواری‌یە • لێ براستی گەلك کێم بویە ، لبەر مرنێ‌یە دهەموادە نەمایە • کێم جارا خویا دکي •

## ٢ ـ بەرناڤێ کرنێ ماي ( ٥ ) پینجن : ( ئەز تو ئەو ئەم ون ) :

## کرنا بۆری تێ‌پەر     کرناناکا   کرنا هێتێ

| | | | |
|---|---|---|---|
| من خواری‌یە ـ من • | ئەز دخوم | ئەز دێ بخوم | ئەز |
| تە خواری‌یە ـ تە • | تو دخوی | تو دێ بخوی | تو |
| وی‌خواری‌یە ـ وي • | ئەو دخوي | ئەو دێ بخوي | ئەو |
| وێ خواری‌یە ـ وێ • | ئەو دخوی | ئەو دێ بخوی | ئەو |
| مە خواری‌یە ـ مە • | ئەم دخون | ئەم دێ بخون | ئەم |
| وە خواری‌یە ـ وە • | ون دخون | ون دێ بخون | ون ـ هون |
| وا خواری‌یە ـ وا • | ئەو دخون | ئوێ بخون | ئەو |

دڤردە : هاتە خویا کرن کۆ تەکێ نێرو تەکێ مێ وکـۆم بیەك بەرناڤێ تێن • ( ئەو ) ژ بو هەرسیا هاتیە دانین •

## ـ دکرنا تێ‌نەپەردە :

| بۆری | ناکا | هێتێ | بەرناف |
|---|---|---|---|
| ئەز چوم | ئەز دچم | ئەز دێ بچم | ئەز |
| تو چوي | تو دچي | تو دێ بچی | تو |
| ئەو چو | ئەو دچی | ئەو دێ بچی | ئەو ـ نێروتەك |
| ئەو چو | ئەو دچی | ئەودێ‌بچي | ئەو ـ ژبۆ تەکێ‌مێ |
| ئەو چون | ئەو دچن | ئەو دێ‌بچن | ئەو ـ کۆما نێرومێ |

## كرنابۆري     كرناناكا     كرناهينتێ     بەرناف

ئەم چون     ئەم دچن     ئەم دێ بچن     ئەم
ون چون     ون دچن     ون دێ بچن     ون ــهون

دڤردە : هاتە خويا كرن كۆ بەرناڤا ( ئەو ) ژبۆ تەكێ نێرو تەكێ مێ وكۆما نێرو مێ تێ گۆتن ....

## :ــ پەرگالا بەرناف :

هاتە خويا كرن د كــــورمانجي دە دو نفش بەرناف هــەنە : نفشەك ژبۆ كرنا تێپەرا بۆرييە . ونفشەك ژبۆ هەمي كرنێ ماينە .

:ــ هاتە زانين كــــۆ : بەرناڤێ كرنا تێپەرا بۆري ٧ حفتنو بەرناڤێ كرنێ ماي ٥ پێنجن .

:ــ هاتە زانين كۆ ( ئەو ) ژبۆ ٣ سێ داخوازا تێ .

:ــ هاتە زانين كۆ : بەرناڤا ( تە ) بچەند تەڤگرو رەوشا تێ .

ــ ( تە تو تێ تي ت تۆو ) :     وەك :

:ــ تەخوار تودخوى تێ بخوى تي چاوايە ؟ ت چاوايە ؟

:ــ جانەكەشم بۆ تۆيە ــ ( جزير خێزا كابايە ــ رێزا ناڤێ ئەزو تۆ ....

:ــ هاتە زانين كۆ بەرێ ( ئە ) لسەر چەند بەرناڤێ كورمانجي هەبو لێ ايرۆ نەمايە ، يا پرهندك مايە .

:ــ هاتە زانين ( ن ) ژبەرناڤا ( وان) هاتيە راكرنــهاتيەآڤێتن. لشونا وان خوارييە تێ گۆتن : وا خوارييە . ژبۆسڤكي ولۆبويە.

:ــ هاتە زانين كــۆ :ــ ( وي وێ وا ئەو ) هم بــەرنافو هم نيشاندانن . ياني ئەم كارن دهەردوا دە بێژن :

دسۆراني دە : ( ئە ــ ئێ ) لبەرناڤا ، دپێش دە زێدە دبن :

## ١ ـ دورستنه كۆ بیژن :

ـ ئەمن خواردم
ـ ئەتو خواردیت
ـ ئەو خوارد
ـ ئێمه خواردمان
ـ ئێوه خواردتان
ـ ئەوان خواردیان ...

## ٢ ـ وها رەنگە دروستنه بێ گوتن :

ـ خواردم ، خواردیت ، خواردن .
ـ خواردمان ، خواردتان ، خواردیان ...

## : ـ بەرناڤن ـ ، یا نیشانن ؟

بآورا هن زمان زانێ کورد ئەو خوه پێگرێ داویا گـــۆتنێ بەرناڤن . لێ د آورا مەدە نیشانن .

: ـ ئەڤ نیشان ، یا بەرناف دکورمانجی دە دکرنا بۆري تێپەر دە پەیدانابن . لێ دکرنا بۆري تێنەپەر دە ٢ نیشان هەنە وەك :

ـ ئەز چوم ، تو چو ، ئەو چو ـ م ـ
ـ ئەم چون ، ئەو چون ، ون چون . ـ ( ن )

## : ـ لێ دکرناناکا وهینێ دە ( ٣ ) سێنە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەز دچم | ئەز دێ بچم | ئەز دخوم | ئەز دێ بخوم ـم |
| تو دچي | تودێ بچی | تو دخوي | تودێ بخوي ـي |
| ئەو دچي | ئەو دێ بچی | ئەو دخوي | ئەودێبخوي ـي |

ئەم دچن      ئەم دێ بچن     ئەم دخون      ئەم دێ بخوزن
ـ بهەڤره بجڤن دبن ( ٣ ) نیشان : ( م ـ ئي ـ ن ) ...
: ـ ئەڤ هەر سێ نەبەرناڤن ، بەلکی نیشانن : ( م ) نیشانا دەنگبێژە . ( ئي ) نیشانا پێشبەرە . ( ن ) نیشانا کۆم .

**ـ ئەز دبیژم : نەبەرناڤن ژبەرکۆ گلك جارا ب بەرناڤێ پیشڤە گیر ڤە دجڤن ـ کۆم دبن . وەك:**

ـ ئەزم ـ ئەز دخوم ـ ئەمنم ـ ئەمن ئەخوم ...
: ـ ئەگەر ئەم تماشا بکن ـ ( ئەزم ـ ئەمنم ) دبێنن کۆ دو بەرناڤ بهەڤ رە جڤیانە ـ بهەڤرە کۆم بونە .. وەها رەنگە :
: ـ ( ئەز دخوم ـ ئەمن ئەخوم ) دبێنن کۆ کرنەك بچوك کەتیە ناڤبەرا دو بەرناڤا : ( ئەز دخو ـ م ) و ( ئەمن ـ ئەچ ـ م ) .
: ـ بێ گۆمانە کۆ کەتنا کرنەکە بچوك دناڤبەرا دو بەرناڤادە تشتەکی نەباشە .
: ـ هەر بڤی آوای گراني‌و سەرگێژي دکەڤي شیوەێ سۆرانێ وئەڤ پەیڤێ زێدە بێ‌کار زمان دگەرێنن و کاغەزێ دادگرن وەك :

| کورمانجی | کرنابۆري | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| من مخوار ـ م خواریە ، | ئەمن خواردم | ئەمن خواردومە . |
| تە خوار ـ تەخواریە ، | ئەتو خواردیت | ئەتو خواردوتە |
| وي خوار ـ وی خواریە ، | ئەو خواردي | ئەو خواردویە . |
| مەخوار ـ مەخواریە ، | ئێمە خواردمان | ئێمە خواردمانە |
| وەخوار ـ وەخواریە ، | ئێوە خواردتان | ئێوەخواردوتانە . |
| واخوار ـ واخواریە ، | ئەوان خواردیان | ئەوان خواردیانە |
| وێخوار ـ وێخواریە ، | .... | ... |

| کورمانجی | کرناناکا | سۆراني |
| --- | --- | --- |
| ئەز دخوم ــ ئەز دچم | ئەمن ئەخوم ــ ئەمن ئەرۆم | |
| تو دخوي ــ تودچي | ئەتو ئەخويت ــ ئەتو ئەروات | |
| ئەو دخوي ــ ئەو دچي | ئەو ئەخوي ــ ئەوئەروی‌ــ ئەروا | |

| کرمانجی | کرناناکا | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| ئەم دخون ــ ئەم دچن | ئێمە ئەخون ــ ئێمە ئەرۆن | |
| ون دخون ــ ون دچن ؛ | ئێوە ئەخون ــ ئێوەئەرۆن | |
| ئەو دخون ــ ئەو دچن ؛ | ئەوان ئەخون ــ ئەوانئەرۆن | |

دڤرده : ژمەڤە هاتە خویاکرن کو دسۆرانی دە • هنك تیپ زێدە هاتنە دانین • چاوا کۆ هاتە خویاکرن ( گۆتن ) دناف دو بەرناڤا دە ــ دناف دو ( راناوا ) دە چاوا دیلو پەریشان مایە• خەسما دکرنا تێپەرا بۆری‌دە گلك ئەشکرا دبن •

## : ــ دکرنا تێپەرا بۆری لپاشي یا گۆتنێ دکورمانجی‌دە بجارەك نیشان ــ راناو پەیدا نابن • لێ دسۆراني‌دە لپیش ولپاش هاتنە دانین :

| کورمانجي | بەرناڤو نیشان | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| م ــ من •••• | بەرناڤ ••• | ئەمن ــ دم |
| تە ــ •••• | بەرناڤ ••• | ئەتۆ ــ تۆــدئیت |
| مە ••••• | بەرناڤ •••• | ئێمە ــ دمان |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وه | .... | بەرناف ... | ئەو | ـ | دي |
| وي | .... | بەرناف .... | ئەو | ـ | دی |
| وێ | ... | بەرناڤێ‌مێ ... | ئەو | ـ | ... |
| وا | ـ | وان | بەرناف ... ئەوان | ـ | دیان .... |

## کرناناکا تێپەر :

| کورمانجی | ... | سۆرانی |
|---|---|---|
| ئەز ... م | بەرناڤو نیشان | ئەمن ... م |
| تو ... ي | بەرناڤو نیشان | ئەتۆ .. ت |
| ئەو ... ي | بەرناڤو نیشان | ئەو ... ي |
| ئەم ... ن | بەرناڤو نیشان | ئێمە .... ن |

| کورمانجی | | ناڤو نیشان | سۆرانی | |
|---|---|---|---|---|
| ئەم | ـ ان | بەرناڤو نیشان | ئێمەمان | ـ ن |
| ئەو | ـ ان | بەرناڤو نیشان | ئەوەیان | ـ ن |
| ون | ـ ان | بەرناڤو نیشان | ئێوەتان | ـ ن |

: ـ هەروەها دور و درێژ دناف بەرا هەردو بەرناڤادە زێدەبون ژ کێم‌بون پەیدا دبن ٠ ۆ بڤی آواي هەردو شـیوە ژهەڤ دور دبن ٠

: ـ چـەڤاس دوري و درێژي دناف بەرا ڤان چـەند گـۆتنێ ژێري دە هەیە ؟ بـنەرن :

| سۆرانی | کرناناکا | کورمانجی | تەڤگەر |
|---|---|---|---|
| ئێوەتان نان ئەخون | ـ | ون نان دخون | ٦ ٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئێمەمان نان ئەخون | ــ ئەم نان دخون | ٦ | ٤ |
| ئەوەیان نان ئەخون | ــ ئەو نان دخون | ٦ | ٤ |

| سۆراني | كرنا بۆری تێپەر كورمانجی | | تەڤگەر |
|---|---|---|---|
| ئەمن نانم خوارد | مە نان خوار | ٥ | ٣ |
| ئەتۆ نانت خوارد | تە نان خوار | ٥ | ٣ |
| ئەو ناني خوارد | وي نان خوار | ٤ | ٣ |
| ئەو نان خوارد | وێ نان خوار | ٤ | ٣ |
| ئێمە نانمان خوارد | مە نان خوار | ٥ | ٣ |
| ئێوە نانتان خوارد | وە نان خوار | ٥ | ٣ |
| ئەوان نانیان خوارد | وا نان خوار | ٥ | ٣ |
| | | ٣٣ | ٢١ |

## كورمانجی تیپ بسۆرانی تیپ

مە نان خوار ٨ ئەمن نانم خوارد ١٢

: ــ دهن جهێ دي دە كورمانجی زێدەیە وسۆرانی كێمە وەك :

## سۆرانی :

: ــ خوشكەم ــ داكەم ــ براكەم ــ باوكەم ــ خەزمەم ...

## كورمانجی

: ــ خوشكا من ــ دیا من ــ براێ من ــ باڤێ من ــ مرۆڤێ من

| تەڤگەر سۆرانی | | تەڤگەر کورمانجی | |
| --- | --- | --- | --- |
| خوشکەم | ... ٢ | خوشکا من | ... ٣ |
| داکەم | ... ٢ | دیا من | ... ٣ |
| براکەم | ... ٣ | برایێ من | ... ٤ |
| باوکەم | ... ٢ | باڤێ من | ... ٣ |
| خەزمم | ... ٢ | مروڤێ من | ... ٤ |
| | ١١ | | ١٧ |

: ـ بێ گۆمانە کۆ ئەو زێدەبون دهەردو شیوا دە سەرگێژیە کە مەزن دزمانێ کوردی دە پەیدا دکی ،ۋبەرەبەرە ئەگەر ئەم رێبدن وێ دوزمانا دەرخی مەیدانێ •

: ـ بآورا من ئەو کەسێ کۆ دخوازن ڤێ نەخوەشیێ دەرمان نەکن دخوازن ، یا وەکە دەکتۆرێ نەزان بڤێ نەخوەشیێمە بکوژن•

: ـ وادزانم دسۆرانی دە ( من ) لشـونا ( ئەمن ) و ( تو ) لشونا ( ئەتو ) تێ خوندن و ڤیـاندن • دکارن ڤا نێ دي ژی ولـۆ بکورتي بێژن •

: ـ چوا کۆ دڤیسارێن کورمانجی دە گلك جاران خوشـکم و برام ... هاتیە گۆتن • دکارن هەمو گـۆتنێ گران بڤی آواي سڤك بکن ....

: ـ ئەگەر ئەم بێژن ( مەخوار ) ـ ئەمن خواردم •• گـرانیا سێ ٣ یا ٤ تیپا ژ سەر زمانێ کورد رادبي ...

ئەگەر بێژن : ـ خوشکم ـ خوشکا من••گرانیا دو تیپا ژسەر زمانی مە رادبي •

: ـ بەرەوپێشوە بۆ یەکتیيا زمانێ کوردی ...

## :ـ بەرناڤێ پاشگر :        ( ئێ ـ ئي )

:ـ هەروەکو هاتیە زانین د آورا مەدە ئەوێ ل‌پاش گوتنێ‌تێن: دکورمانجي‌دە ( م ـ ئي ـ ن ) نیشانن نەبەر ناڤن •
م ـ نیشانا دەنگبێژە • ئي ـ نیشانا تەکێ پەندیو نەپەندی‌یە ن ـ نیشانا هەمو کۆمایە •••
دسۆراني دە ( م ـ ئي ـ ایت ـ مان ـ یان ـ تان ) هـــەمو نیشانن نەبەرناڤن •••
ـ لێ ( ئێ ) بەرناڤەکە پاشـــگرە پرێ جاران دکورمانجی دە ل‌پاش تیپێ راکێش تێ        وەك :

ـ من بدار ل‌بارام خست
ـ من پێ لێ خست ••• ( ئێ ) دڤردە ل‌پاشـ ( پ ـ ب • ) و ( ل ) هاتیە شونا ( دار ) و ( بارام ) گرتیە •••
هەروها :ـ من سێڤەك ژ دارێ کر • من سێڤەك ژێ کر •••
:ـ دڤردە ( ئێ ) بەرناڤەکە شونا دارێ ستاندی‌یە • ودگەل تیپا راکێش هاتیە •

هەروەکو دسۆراني دە ( ئي ) ژي ڤێ دەلامە تێ دبێني  وەك :
:ـ نانێ بارام خوشە ـ ناني زۆر خوشــە ـ نانەکـەي زۆر خوەشە ••••
:ـ دڤردە ( يي ) بەرناڤەکە شونا ( بارام ) ستاندي‌یە لێ نەدگل تیپا راکێش هاتیە ••• •

ئەگەر ئەم کور بکۆلن دبي هەنە دي ژي هەبن ••••
ـ هەروها د آورا مە دە ( خۆ ) نەبەرناڤە ، بەلکی خــورتي و پاش مێرە ژبۆ بەرناڤ • ژبەرکۆ گلك جاران ب بەرناڤارە کۆم دبي ـ دجڤی •        وەك :

: ــ دزمانێ عربي ده لهەمبەر ( خۆ ) ( نفس ــ شخصية ــ ذاة ) هاتنه •

: ــ کەنگی ئەم دبێژن : ــ ئەز بخوه چوم ــ ئەمن بەخــــۆم رەوشتم • داخواز بعربي :

( انا ذهبت بشخصيتي ــ بنفسي ــ بذاتي ) ••••

: ــ ئەز بخوه دچم ــ خۆم بەخــــۆم ئەرۆم • وێ چاخێ دسۆرانی ده

( ٥ ) بەرناف کۆمدبن : (خۆ ــ م خۆ ــ م ــ م)• دکورمانجیده

( ٢ ) بەرناڤو ( ١ ) نیشانەك کۆمدبن : ( ئەز ــ خوه ــ م )وێ چاخێ گەرەکه زمانێ کوردی هەمي بەرناف بي •

: ــ ئەگەر بێن ؤ بکورتي بێژن : ( خۆم ئەرۆم ــ بخوه دچم) دسۆراني ده ٣ بەرناف ، ودکورمانجیده بەرناڤەك و نیشانەك دجڤن • ئەڤ ژی نەهندکه دزمان ده •••

ژبەر ڤي آواي ئەم کارن بێژن : ( خۆ ) ژبۆ خورتیيا ناڤو بەرناڤه هاتیه :

ــ بارام بخوه هات ــ ئەو بخوه هات •••

ــ شێرین بخوه چو ــ نەسرین بخوه هات

ــ ئەو بخوه هات ، وي بخوه خوار •••

ــ ئەز بخوه هانم ، ئەز بخوه چوم

ــ تو بخوه هاتي ، تو بخوه چوي

ــ وی بخوه گۆتیه ، وێ بخوه گۆتیه

ــ وان بخوه گۆتیه ، وا بخوه گۆتیه

## : ــ بەرناف و نیشــاندان :

هن زمان زانێ کورد هەنه کۆ نیشـــاندان ژبەر ناڤا ژمارتنه •

براستي گللك نێزيكى راستيێ بونە ، لێ نيشاندان نەبەرناڤن • ژبەر كۆ گللك جاران بناڤو بەرناڤا رە دچڤن •

دەما كۆ بێژن : ( ڤي خواري‌يە ) دروستە كۆ بێژن : ( ڤي شونا ناف ستاندي‌يە • لێ بێژن : ڤي مێركي نان خواري‌يە ـ ئەم كابرايە نەباشە •••

: ـ وێ چاخێ نكارن بێژن بەرناڤە • ژبەر كۆ ( كابرا ) ـ ( مێرك ) ••• بخوە بەرناڤێ نەناسە •

: ـ هەروها ناڤو نيشاندان تم بهەڤرە دجڤن ، ژبەر ڤە ناي • هەروەكو ئەم دبێژن : ئەڤ بارام ـ ئەم شێرينە • نابي كۆ ئەم باوربكن كۆ ( ئەڤ ) و ( ئەم ) بەرناڤن • وێ چاخێ يەك كارى بێژي : ژبەركێ ڤە هاتنە ؟ ئەم نكارن بەر سڤا وى بدن •

باوەرم كۆ بڤا چار ناڤێ نيشاندان هاتنە خاپاندن ( وي وێ وا ئەو )

: ـ براستى ئەڤ ( چار ) دناڤ بەرناڤا دە تێن • وهەم دناڤ نيشاندانا دەتێن • لێ چاوا ژهەڤ خويا دبن ؟

: ـ ئەم كارن بێژن : دەما كۆ داخواز ونداو نەپەندي‌بي ئەڤ ( چار ) بەرناڤن • وەك :

ـ وي گۆتيە ـ وێ خواري‌يە •••

: ـ جا ئەگەر ( ڤي ) دپێش دە هاتيە و داخواز دياري چاڤە نيشاندانە • لێ ئەگەر داخواز ونداونە پەندي‌يەو ( ڤي ) دپێش دە نەهاتيە بەرناڤە • ژبەركو چە دەما كۆ ئەم دبێژن : ڤي خواري‌يە ؟ يا وى خواري‌يە ؟ وێ چاخێ هەردو ژي بەر چاڤن تەنێ ( وي ) ژ ( ڤي ) هنك دورتر ۋ جارنا بهەڤردنە • لێ دەما ئەم دبێژن :

ـ بارام دەرمان نەكري‌يە ـ وي دەرمان نەكري‌يە • ( وي ) ژبەر ( بارام ) ڤە هاتيە گۆتن كۆ بخوە نەدياري چاڤە ـ نە پەندي‌يە ( ئەڤ ئەو لمرۆڤە ) سێ بەرناڤ بهەڤرە كۆم بونە ئەوژى نە دروستە •

## نیشاندان

ڤي خواري‌یه ــ وی خواری‌یه دو نێر بەر چاڤن •
ڤێ خواري‌یه ــ وێ خواری‌یه دو مێ وبەر چاڤن•
ڤا خواري‌یه ــ وا خواری‌یه کۆمەك بەرچاڤن •
ئەڤ دخوي ــ ئەو دخوي دو بەر چاڤن •
ئەڤ دخون ــ ئەو دخون کۆمەك بەر چاڤن •
ئەم خوارد ــ ئەو خوارد دو بەر چاڤن
ئەمان خواردیان ؟ ــ ئەوان خواردیان ؟ کۆمەك بەرچاڤن

: لێ دبەر ناڤا دە نەبەرچاڤن : بارام هات ؟ــنائەو تەنێ نەهاتیە•
: ــ وێ چاخێ ( ئەو ) نەبەر چاڤە ؛ ژبەر بارام ڤە هاتیە •

: لێ براستی گلك دژوارە کــۆ هەرکەس کاربي ژهەڤ بدی آلي • ژلەورا دبێژم ئەگەر بێ گۆتن : ( بەرناڤێ أشــاري ) نەدوري راستی‌ێ‌نه ؟ لێ براستی‌نه بەرناڤن • ژبۆ نیشــاندان هــاتنه • بەرناڤ بخوه بواتێ نیشـاندان : ــ ( ئەڤ ئەو مرۆڤە ) : ــ ئەوژی ئەڤە ــ ئەڤ ژی ئەوە •••

## : ــ بەرناڤێ نەناس ــ مبهم :

## ئەڤ ژی دو برن :

١ ــ یەك داخوازەك پیڤاي ژێ رە نینە •

٢ ــ برادوەم بێ داخوازە ••

١ ــ کەس ، هن ، گش ، تەڤ ، هەمو ، پر ، کێم ، پچ ، جۆر ــ گۆر ، زۆر ، گلك ، هێچ ••• ژڤان رە داخوازەك هەیە لێ بێ‌پیڤانە •
٢ ــ ئەوك ، چیك ، ایڤەر ، یارێ گۆنێ ، فلان • هرام ، وانەك ،

فیسار ، کابرا ، یارۆهێن ، ••• ژڤا ره داخواز نینه ••••

: ـ دەما ئەم دبێژن : هــن مرۆڤ هــاتن • ئەم دزانن ( هن ) چەندە کە ـ ژمارەکە لێ نزانن چەند کەسن ؛ یا چەند تشتن • هەوها ( گش ) ئەم دزانن کۆمەکە لێ نزانن چەندن ، بێ پیڤانه •• •

: ـ لێ دەما دبێژن : ( چوبومە مالا ئەوکۆ ) • بجارەك كەس نزاني ئەو کۆ کیـیە ؟ ـ چیه ؟ بجارەك نەناسو بێ داخوازە • بەس دخوازی داخوازا خوە بێنێ بیرا خوە لێ نکاري ناڤێ خوەدییێمالێ بێژی ناچارە دي ( ئەو کۆ ) چیکۆ ، فیسار ••• دەیني شونا وي •

: ـ لێ کۆلانەك هور وکور ژێ ره دڤێ ؟



## ( ٢١ ) ـ ئێ ـ آ ـ

: ـ بەري هەرتشتی ئەڤ هەردو تیپ نیشانا نێرو مێ نه :

بارامێ مه ـ شێرینا مه •

: ـ دکۆکا خوەدە : بارام ئێمه ـ شێرین آ مه • لێ ژبو سڤکی تەڤگرا ( ئێ ) دانه ( م ) د ( بارامێ مه ) ده • وتەڤگر ( آ ) دانه ( ن ) د ( شێرینا مه ) ده • هەروەکو دنێرو مێ ده دەرباس بونه •

: ـ هەروها ( ئێ ) بەرناڤەکي پاشــگره خــوه بتیپا راکێشــ ڤەدگری چاوا کۆ دەرباس بویه :

ـ لێ دخي ـ لئێدخی • شــونا ناڤ ، یا بەرناڤ گرتیــه • لبارام دخی ، یا لوی دخی •

ـ ژێ دکي ـ ژ وی دکی •

ـ پێ دخوی ـ ب وی دخوی •••

: ـ دڤا هەموادە (ئێ) بەرناڤە پاشگرە، هەروەکو دەرباس بویە،
ـ چاوا تێ بەرگومان و آورا من بحەفت داخوازا هاتییە :
١ ـ ئێ نیشانا نێر دپالڤدانێدە • و ( آ ) ژبۆ مێیە •
٢ ـ بەرناڤە هەروەکو دەرباس بویە •
٣ ـ دبەرناڤو نیشاندان دە(ئێ)ژبۆ مێو (ئي) ژبۆ نێرە،
٤ ـ ژبۆ خوددي تيیە : ـ ئەڤ ( ئێمنە ) ئەڤ ( آمنە )،
٥ ـ ژبۆ(صلە)تێ : ئێ چوي ژئێماي کێم ترمـژبۆ نێرایە
٦ ـ ژبۆ دان زانینە : ـ ئێ گۆنێ هاتیە • آگۆنێ هاتیە •
٧ ـ ژبۆتەکە دژمارا یەکەم دە ـ ( آ ) ژبۆ کۆمە :

مریشکێ خوار ـ مریشکا خوار • ئەڤ ( آوا ) دناڤێ نێرومێدە
حولۆیە •

## آواك :

چە دەما داویا ناڤ ( يي ) بێ ( يا) لشونا ( آ ) تێ • د مێیادە •
ودنێرا دە ( يي ) لشونا ( ئێ ) تێ •••
: ـ چەفیا مە ـ چەفي ـ آمە • گەليێ مە ـ گەلي ئێمە •

---

## ( ٣٢ ) ـ بانکراو ( المنادی )

ـ ناڤێ بانکراو ئەو ناڤە کۆ مرۆڤ دکاری بڤـان آلاڤێ پاشی
دەی لێ بکي • وەك :

ـ ئەی هەڤال ! ـ ئەي فلەك ! ـ ئەي وەلات !
ـ یا هەڤال ! ـ یاچاڤێ من ! ـ یا خوشکا من !
ـوا بارام ! ـ وا شێرین ! ـ وا هەڤالۆ ! ••

: ــ داويا ناڤێ بانكراو جارنا وەكە خوە دمێني : ــ وا بارام !ــ بارام گرێداي مايە •

: ــ وجارنا ( ۆ ) دكڤي داويا وی : ــ وا بارامۆ ! ــ وا رەشۆ ! ــ وا سۆرۆ ! ••••

: ــ وجارنا دمێ يادە ( ئێ ) دكەڤي داويا ناڤ : ــ وا زينێ ! وا گەورێ ! •••

: ــ وجارنا (آ) دكەڤي داوي : وا جانا !ــئەی جانا !ــجانا !••

: ــ هەروها جارنا بێ آلاڤ تێ :

ــ جانا ! تەجهان گرتي سەرا سەر بجوانی •••

ــ دلبەر ! تووە رە جارەكێ دا ئەزتە ببينم •• •

ــ لێ گلك جارا ب آلاڤ تێ : ــئەي فەلەك ! ئەي دلۆ ! ــئەی هەڤالۆ ! ••••

ــ دسۆراني دە جارنا ( ئە ) لداويــا وی تێ : ــ مچە ! حەمە! كچە ! ••••



## ( ٣٢ ) ــ آلاف :        ( آدات ) :

### : ــ آلاڤ :

: براستي نە ناڤن • لێ دناڤ بەرا ناڤو تيپ دە جهكی مــەزن دزمانو دەستورا زمانا دە ستاندنە • هنك بداخواز وهن بێ داخوازن لێ هەر چاوا بي ژ گۆتنێ تێنە ژمارتن •

: ــ لگورا آورامن ٢٤ پەرچە ــ بيستوچار نفشــن • هــەر نفشەك سەربخوە هاتنە تڤيسين • دڤردە دخوازم ژوەرە دور و درێژ بدم بدارڤەكرن •

: ـــمه آلاڤــبسەرناڤ دە بەردانە ژبەركۆ پێتر تێزیكی ناڤن• لێ هەروەكو سەربخوە و پەرچاك ژ ئێ ( گۆتنێ • ) نە • گەرەكە بێنە دانین •

## ١ ـ آلاڤێ بانگێ ( أدات النداء )

: ـ آلاڤێ بانگێ ئەون كـۆ مرۆڤ بوان كاری دەي لمرۆڤو تەباو تشت بكی •

## ـ بانگ : بخوە دونڤشن :

١ ـ بانگا ب آلاڤ •
٢ ـ بانگا بێ آلاڤ •

ـ ئەو آلاڤێن كۆ مرۆڤ بوان دەي لبانكراو دكي ئەڤن :

## ١ ـ ( ئەی ) ـ ژبۆ بانگا نیزیكە • وەك :

ـ ئەي هەڤالۆ ! دەلالۆ ! تو هەرتشتی دزاني •
ـ ئەي فەلەك ! فەلەك ! ئەي زالم فەلەك !
كا ئەو كوردستان ؟ كا برجێ بەلەك ؟
جزیری : ـ ئەی شەهنشاهێ معەظم !
خانی : ـ ئەي شكرێ‌تە جەوهەرێ زماني !
جارنا ـ هەی تێ گۆتن :
ـ هەی لۆ داۆ ! هەی لۆ دلۆ !
ـ هەی نازێ نازێ نازێ ! •••
ـ هەي وایێ ! هەي وایێ ! •••

## ٢ ــ يا ــ ژبۆ بانگا نيزيكه :

ــ يا هەڤالێ دەلال ! ــ يا براێ عزيز !

ــ يا چاڤێ من ! ــ يا باڤێ‌مز ! ••••

ــ دەما كورد رادبن سەرخوە دبێژن : ياخوەدێ ! ياالله !

باوەرم كۆ ( يا ) د ( يابۆ ) و ( يادی ) دە ژبۆ بانگێ‌يە ، نەژكۆكا گۆتنێ‌يە • يا ئەبو ! ۆ يا ئەدێ ! يە • لێ ژبۆ سڤكی بونە ( يابۆ ) و ( يادێ ) نەابونە دو ناڤ ژدێ وباڤێ‌رەءلجەءمە بانگ دكن و دبێژن : وا يادێ ! وايابۆ ! تيپا بانگێ كۆ ( وا ) يە دپێش دە دبێژن •

## ٣ ــ ئەلا . يان هەلا : ژبۆ بانگا دۆرونيزيك تين :

ــ ئەلا ئەي دلبەرا نازك بەدن وەك جامي بەللۆری !

ــ ئەلا ئەي دۆستانێ من !

**خليفه سليم ــ**

ــ هەلا رابن گەلي كوردا ! ژباژارا هەتا گوندا

ــ بيەك ( م ) مەدين بەردا وهانينە مسلماني •

جارنا ( هلو ) تێ گۆتن :

هلو دام بچنە سەيرانێ !

## ٤ ــ وەی :

وەكە ئەی ــ هەي تێ گوتن لێ پر تێ دە غەيد هەيە :

ــ وەي گاورێ ! وەي مال خەراب !

ــ وەي كەكۆ ! براۆۆ ! ــ وەي لڤێ تالانيێ !

ــ وەي لۆ! وەی‌لۆ ! • وەي‌لێ !وەي لێ ! وەی‌لابێزێ!

ــ وەي لادائ ! وەی‌لۆ برا ! وەی‌لۆ محمدۆ ! لۆبرا ! ••

## :ـ جارنا ( وي ) تێ گۆتن

ـ لاوکۆ ! تۆبەدارۆ ! وي دلێ من ! عەمرێ تە •
ـ وي لۆلۆ ! دەوي لۆلۆ ! دەوێ‌لۆلۆ ! دەوي لۆلۆ ! •

## ٥ ـ ( وایێ ) ـ ژبۆ آڤیتنا سەر مري وکوشتیا تێ :

ـ دەوایێ ! دەوایێ ! خالدۆ ! لاوۆ ! دەوایێ ! خالدێ رزگـۆ چویە تاسیلا تا بازارێ ( وانێ ) ترسامنە ژوێ ترسێ‌یە بسەر جۆتێ خانما ل برجا بەلەك ڤناگەرە نائێ لۆلۆ •••

دەواي ! لم ، دەواي ! لم ••• مالا منێ !
حەیفەو غەبینەتا چاڤێ رەشەبەلەك لسرتا گۆلێ آخ‌وآف کەتێ

ـ هاي دەوایێ ! هاي دەوایێ ! باندکێ قەي تونا ئێ ؟ توکفۆکا لدەرێ چایێ ، توکەرۆ شکال ناف لە مایێ •••
های دەوایێ وایێ ! ••••

## ٦ ـ هەیلا :ـ دديلۆکا دەگلك تێ گۆتن :

ـ هەیلا بێژێ ! لتە بێ‌زارێ •
ـ سێڤا سۆرێ لگولیا دارێ •
ـ خورتنۆ ! لێخن بێنن خوارێ •

جارنا هەی لۆ ـ هەي لێ تێ گۆتن ، خویایە ( هەیلا و هەیلێ ) ژبۆ مێ‌یا تێن ، ؤ ( هەیلۆ ) ژبۆ نێراتێ • دڤردە دبي کۆ آلاف ، هەر تەنێ ( هەی ) وەکو دەرباس بویە و ( لۆلێ ، لا ) بـەرناف بن • وێ چاخێ ( هەیلا ) ژ آلاڤا نایێ ژمارتن ؟

## ٧ ـ ( وا ) ، ژبۆ بانگا دوره :

ـ وا ردشۆ ! وا ردمۆ ! وا بارام ! ...

## ٨ ـ ( هوۆ ) ، وەکە ( وا ) تێ گۆتن :

ـ هوۆ رەمێ هوۆ ئۆسۆ ! هـوۆ گـەورێ ! هوۆ رنـدێ هۆ پەریشانێ ! ....

## جارنا ( هوي ) تێ گۆتن :

ـ هۆی نازێ ! نازێ ! نازێ ! بچوکێ گەردەن گازێ !
سینگ گەور بەرفال بۆغازێ ! خوەزي ب کەسێ تە بخوازێ !
ـ هۆي هۆي لمن ! هۆي لمن !
ـ هۆي هۆي لمن ! قدرەتێ !

## ٩ ـ ( ئەرۆ ) و ( ئەرێ ) وەکە ( لۆو ) ، لێ ـژبۆ بانگێ تین : ( ئەرۆ ) ژبۆ نیراو(ئەرێ)ژبۆ مێیاتین :ـ ئەرۆ رابە نەم هەرن ! ئەرێ خوشکێ !

## جارنا ئەرێ ژبۆ نیرا ژي تێ :

١ ـ ئەرێبرا : ئەرێ هەڤال ! وێ چـاخێ بداخـوازا ( نعم ) دزمانێ عەرەبي دە تێ ئێ دیسا بانگ تێدە هەیە
هن دبێژن : ( آرا ) دبي ژ ( آیا ) دەر کەتبي ، یان ژ ( ئـەرۆ ) ددەرکەتیە .
ـ خلکێ ( دارێ ) دبێژن : آرا ابرۆ رۆژەکە .

## ٢ ـ بانگا بێ آلاف :

: ـ بانگا بێ آلاف ئەوە کۆ بێ آلاف مرۆڤ باکی بانکراو ئەڤ نفشێ بانگێ بدەنگ تێ خویا کرن • ددواي دە ( ۆ ، ێ ، آ ، ي ) تێنە خویاکرن : ـ کەکۆ ! کورۆ ! براکۆ ! هەڤالۆ ! •••

ـ گەورێ ! بوزێ ! ! شێرینێ ! رەوشێ ! •••

ج : ـ جانا ! توبخوە قائد و سەر لەشکرێ ژەرمەن •
ایریشە لپۆلۆن
آور بخوە تۆپێ کۆ لسەر ساحلێ مانشن •
من دل بـوە لۆندۆن •••

جزیری : ـ ملا ! هەروی بیین هەروی
ـ ملا ! مەژ گەردەنا دلبەر ژنو سەد بۆ سە ماین دەین
مەجالە دێ بخوازم ژێ دبێ دەینێ تە فەوق العین •••

**: ـ دەما کۆ داویا ناڤ (ي) بي وەکە خوە دميني:**

عەلي ! زەکي ! فەوزي ! چەلەبي ! برازي !

**: ـ هەروەها کوداویا ناڤ ( ێ ) بي وەکە خوە دميني:**

عەلێ ! عەدێ ! هلێ ! سلێ ! •••

**: ـ لێ ئەگەر گریداي بي گریداي دميني :**

ـ بارام ! فەرهاد ! روستم ! فەلەك ! •• •

ـ روستەم ! چکا بێژە • ـ فلەك ! مالاتە ناڤا ••

: ـ دڤا تەڤا دە آلاڤا بانگێ هاتیە راکرن • ئەم کارن هەریەك ژوان آلاڤەك دپێش دە بێژن •

ـ ئەڤ آوا بدەنگ تێ زانینو د پاشیا وان دە( ! ) دروڤا بانگێ دڤیساندنێ دە داتینن •

## :ـ ئەو ناڤێ کۆ ژبۆ بانگێ هاتنە زانین :

١ ــ بانگ : ــ بانگ بکە نەرهاد ــ باکە نەرهاد •
٢ ــ دەي : ــ دەي لبارام بکە ــ دەي لێ کە •
٣ ــ گازی : ــ گازی بکە زۆرۆ • ــ گازیبکەبارام•
٤ ــ قیر : ــ قیرەکێ بدە رەوشێ • بکە قیر قیر ••••
٥ ــ هاوار : ــ هاوار دکم هاوار نائ •
٦ ــ قۆت قور قرقر قیرقیر : هەمو بداخوازەکێ هاتنە •
٧ ــ پتپت ، چرچر : دەنگێ بێ رومەتن ــ
٨ ــ فریاد
٩ ــ مەدەد
١٠ ــ فغان
١١ ــ آمان
١٢ ــ داد

ئەڤ هەمو دکوردي دەهەنە لێ بمن نەوەکــــە کوردینە •

:ــ دەنگێ تەبا من خستیە ناڤ دەنگا ئەگەر بێو ئەمدەنگێتەبا جنڤیسن بسدا دەنگ دزمانێ کوردی دە پەیدا دبن •

:ــ زمانێ پاش دەماي بێگۆمانە کۆ گوتنێ دەنگي تێ دەگلك خویا دکن ، لێ بەرە بەرە کێم دبن •



## ٢ ــ آلاڤێ خوەشي و نەخوەشي :

### ١ ــ آلاڤي خوەشي :

ئەون کۆ چە دەما ژدەڤێ مرۆڤ دەرکڤن خوەشــي ددن زانین : ژوان آلاڤان :

١ ــ ئۆخوەش : ــ کەنگی مرۆڤ بێژی : ئوخوەش تێ زانین کو تشتەك بمرۆڤ خوش هاتیە ــ خوشیەك گهایە لاشێ مرۆڤ یان ب آوایێ بیرو باوەری تشتەکی خوەش چێ بویە • هەروەکو مرۆڤ تشتکی ب خوی ، یا ڤەخوەی ، یا داخوازەك خوەش پێك هاتبێ ، یا سەر پێهاتیەکە خوەش لجهانێ دەست دابی • هتا کورێ مرۆڤ کۆ لپەی گۆتنا مرۆڤ نەچی وتشتەك بێ سرێ وی مرۆڤ دبێژی : ئوخوەش ! یانی گەلەك بمن خوەش هات کۆ ولۆ هاتە سرێ تە •

٢ ــ (ئۆخەی): ــ وەکە (ئۆخوەش)تێ گۆتن ، لێ لجەم سۆرا تەنێ هەیە • کورمانج نابێژن • سۆرا دبێژن : ئۆخەی زۆر دلم خوش بو کەوات لێ هات • ئۆخەی باوا بسەرت بێ •

٣ ــ ( ئۆخ ) وەکە ( ئۆخەی ) و ( ئۆخوەش) تێ گۆتن •لجەم هن کوردان ( آخۆ ) تێ گۆتن • بەلام ( آخۆ ) لجەم کورمانجا جهێ سەوال وقەرێژە •

٤ ــ ( ئۆهنای ) وەکە هەڤالێ خوەیە دبێژن : ــ ئۆهنای ! چە آڤەکە خوەشە ؟ ئۆهنای ! دلێ من بکوشتنا دژمن گەلەك خوەشبو•

## ٢ ــ آلاڤێ نەخوەشی : ئەون کۆ نەخوەشیەك ددن زانین : وەك :

١ ــ ( آي ) ژبو نەخوەشی تێ گۆتن • دەما نەخوەشیەك دگهێ لاشێمرۆڤ یا سەرپێهاتیەك نەخوەش بسەر مرۆڤ دە تێ ، دبێژی : ــ آي ! •••

٢ ــ ( ئوی ! ) وەکە ( آي ) تێ گۆتن • ئوي ! لاشێ م تێشی ئوی تە ئەز کوشتم ! ئوي ! سەرێ من تێشی • ئوي ! لم رەبەنێ ژاندرە هاتن ، ئوي ! خەوا من نایێ •••

٣ ـ ( ئۆي ) وەکە ( ئوي ) تێ گۆتن • دهن شیوا دە ئۆی ـ لشونا ( ئوي ) دبێژن • دبي کۆ هەردو یەك آلاڤبن ••••

٤ ـ ( آخ ) وەکە هەڤالێ خوە ژبوایێش ونەخوەشي تێ گۆتن • لێ دنڤیسینو خوشخوانو دیوانێ هۆزان بوێژێن کوردا دە گلك ( آخ ) و ( ئۆخ ) تێنە گۆتن : ـمەلاي جزیري دبێژي : ـسەد آخو ئۆخ : ـ آخوئۆخێ من ژ دل تێن •

٥ ـ ( ئۆخ ) دەرباس بویە کۆ ( ئۆخ ) ژبۆ خـوەشيیە • لێ ئۆخ ژبۆ نەخوەشي و ژانداري ژي تێ هەروەکۆ : (جزیري) دبێژي . وەکە ( آخ ) دناڤ کورمانجا دە تێ گۆتن • تەنێ ( آخ ) هـەر ژبۆ نەخوەشيیە لێ ( ئۆخ ) ژبۆ خوەشيو نەخوەشي تێ گۆتن •

٦ ـ ( ئوف ) وەکە (ئۆخە) • دبێژن : ئوف ! لاشێ من تێشي• ئوف ! تلیا من تێشي • جارنا دبێژن : ( ئۆف• ) • ئەڤ ژ نەوەکهڤیـا شیوەیە • لێ براستي ئەم هردوا ژی دبێژن •

٧ ـ ( آە ) وەکە هڤالێ خوەیە • ( فەقهێ طەیرا ) دبێژي :

ـ سەد آە ! وکۆڤان وکەسەر
بعەینو لام کر هجرەتێ •
ـ سەد آە وکۆڤان و گری سوسن لمێرگا غەیری
سەد حەیف ل لێڤێ شەکری أیدي ڤە ناخون شەبەتێ ••



## (٣) ـ آلاڤێ هیڤیو خوەزی : (التمنی والترجی)

: ـ ئەوژي دو پەرچەنە :

١ ـ بگۆمان • هێڤي داري •

٢ ـ بێگۆمان • خوزی •

**: ــ آلاڤێ ب گۆمانو آرەزو ئــەون کــۆ دوان دە هیڤی‌یەك هەیە کۆ مرۆڤ بگهێ داخوازێ • لێ‌ئێ بیگومان ، ئەون کۆ ب‌جارەك هیڤی‌ناکي کۆوێ بگهێ داخوازێ لێ خوەزی دکي •**

١ ــ ( هێڤی ) تێ دە گۆمان هەیە کۆ مرۆڤ بگهێ داخوازێ • تێ گۆتن : ــ ئەز ژتە هێڤی دکم کۆ هەزار دیناری بدي من • گۆمان هەیە کۆ دۆستێ وی هەزار دینار بدی •

٢ ــ ( هێوا ) وەکە هێڤی‌یە لێ دشیوەێ سۆری دە تێ •(هێڤی) ژ هێوا دەر کتیە • ژبەر کۆ ( و ) بەرەبەرە ل ایران و ترکیا وندا دبن و ( ڤ ) شونا وێ دگري ژبەر کۆ ( ڤ ) ژ لێڤا تێ دەر • ( و ) ژدەڤ دەر دکەڤی •

٣ ــ ( تکا ) بداخوازا هێڤی هاتی‌یە دشیوەي سۆرانی دە تێ :
ــ تکا ئەکەم کــە لە خــوندەگە دەرنەچي ! تکا ئەکەم کە بۆ باوکەت چاك‌بي
: ــ یاني هێڤی دکم • ــ هێوام وایە •

٤ ــ ( خوەزی ) • ژ بۆ خوەستنا تشتکي‌یە کو مرۆڤ گۆمانو باوەرناکي بگهێ دەستێ مرۆڤ • خوەزي ! خۆرتاني‌یا من ڤەگەریا ! خوەزی ! کەچا پاشێ دۆستا من بونا ! خوەزي ئەز بچوما ئەزمانا • خوەزی سەد ملیۆن زێرێ من هەبونا •
ــ خوەزي دنیا تەڤ ذدەستێ من دە بونا ! •••
ــ لێ کورد دیێژن : ( کەس ب‌خوەزیا ناگهێ باڤێ کەزی‌یا ) •

٥ ــ خوەزکا ــ خوەزی‌کا • بداخوازا خوەزي هاتنە •

٦ ــ ( کێشکا ــ بەریا ) ل‌ناڤ سۆرا تێنە گۆتن بداخــوازا ( خوەزي )نە • لێ ( کێشکا ) ترکي‌یە • بەلام ( بەریا ) نزانم ژکــو هاتي‌یە •

# ( ٤ ) ـ آلاڤێ تەعجب :

: ـ آلاڤێ تعجـب • ئەون كـۆ چـە دەما مرۆڤ عجێـب ماي دمێني يەكى ژوان دبێژي • گللك جاران پرسـياری ب تعجب رە تێ خويا كرن • ژوان آلاڤا :

١ ـ (هەيها) ـ دبێژن : ئەز كەتم باژارێ بەغداێ • هەيها ! ئەز چە بنەرم ؟ •••

ـ هەيها ! ئەڤ دەر كودەرە ؟ كۆ ئەز لێ دگەرم ؟

ـ هەيها ! سەرێ مە ژنوڤە كەتە خاخێ گران ••••

٢ ـ (آيا)تعجب و پرسياري تێ دە هەنە: سەيداێ خانيدبێژى:

ـ اد بارامە وێ گها كەمالێ     آيا بووە قابلێ زەوالێ ؟

ـيان هەروەهە دێ لاسـتوابت     حتا وەكو دەورێ منتهابت •

ـ ئەز مامە دحكمتا خوە دێ دە كورمانجێ د دەولتا دنێ دە

ـ آيا بچە وەجهی مانە محروم؟ بالجملە ژبۆ چە بونە محكوم؟

: ـ دبي كۆ ( آرا ) ( ئەرۆ ) ( ئەرێ ) هەمي ژ ( آيا )دەركتبن• دهەموا دە بانگ‌و تعجب و پرسيارى هەنە ••••

٣ ـ ( پەك ) ـ دەما مارەكي مەزن دبێنن دبێژن : ـ پەك ئەڤ چە ئەژدەهايە ؟ ـ پەك ئەڤ چەمال وێرانيـيە ؟ ـ پەك لڤێ عجێبێ ئەز چە دبێژم ئەو چە دبێژى ؟ • پەك لمالا بافێ‌م بي • پەك لڤێ تالانيێ •

٤ ـ ( هەك ) هەڤيركا دبێژن : ـ هەك كورۆ ! تو لڤر چەدكى ؟ هەك ماخابۆ ! ئەڤ چيـيە ؟ لشونا پەك تێ گۆتن •

٥ ـ ( أيو ) ـ هن دبێژن : ـ ( عيو ) • ايو مال خرابۆ ! تـو چەڤا كوري ؟ ـ ايو مال خرابۆ ! تو چە ترسۆنەكى ؟

٦ ـ ( ايش ) ايزيدى دبێژن : ـ ايش ؟ كـورۆ ! ئەڤ چيـيە دخوى ؟ ايش ؟ كورۆ ! ولۆ مەكە •

٧ ـ ( ئەررك ) ـ لهنجيـا دبێژن : ـ ئـەررك ؟ كـورۆ !

تێ چەبکی ؟ ئەررك ؟ پا بسوندا تەمام ئەز ولێ ناکم . ئەررك ئەڤچە بازارە ؟ ...

٨ ـ ( هۆ ) دبێژن : ـ هۆ ؟ ئەڤ بارامە هاتیە ؟ هۆ ؟ ئـەڤ چیە ؟ ـ هۆ ئەڤ رەشۆیە ژ زندانێ هاتی‌یە ؟ هۆ تووی رەشۆ ؟ ..

٩ ـ ( ها ) ژبو تعجبە . دبێژن : ـ ها ؟ ئەڤ کورێ خورشیدە ها ؟ فرهادە . هۆهۆ . هەیهۆ . ژبۆ غەیدن .

١٠ ـ ( پەکۆ ـ پەح ) دسۆراني دە هەنە .

١١ ـ وەي . وەیوەي ـ هەی . ژ بۆ تعجبن ...

دڤا تەڤا دە ( تعجب ) و پرسیاری ب هەڤرە هەنە ، یا ب‌هەڤرەتێن ـ بێ‌گومانە کو هنك دی ژي مانە لێ هەو تێنە بیرا من .



## ( ٥ ) ـ آلاڤێ گومان ( التشكيك )

: ـ آلاڤێ گۆمان ئەون کۆ داخواز دناڤ بەرا ئەری ، نا دەیە :

١ ـ ( گۆمان ) دبێژن : ـ گۆمان دکم بارام ل مالە . ـ گۆمان دکم شێرین ل خوەندەگەهێ‌یە . ـ گۆمان هەیە کۆ رەشۆ ڤا رۆژا ژ زندانێ دەرکڤی . گۆمان هەیە کۆ ایسال بەرێ سالێ باش بێ ...

: ـ دڤا هەموادە باوەر ناکي کـۆ داخـوازا وي ب‌جي‌یە ـ نزاني کۆ براستي بارام لمالە ، یانا ـ نزاني کۆ براستي شێرین لخوەندەگهێ‌یە یانا ـ نزاني کۆ رەشۆ ایسـال براستي ژ زنـدانێ دەرکەڤێ ،یانا ـ نزاني کۆ بەرێ سالێ وێ خوەش بێ یانا ..

٢ ـ ( بەلکی ) : سەیدایێ جزیری دبێژی :

ـ بەلکي دیوارێ ب‌گوه بن ب‌خوە دێ کي ب‌خـوە دێ .

ـ بەتو رەنگی تومەکە ئەشکرە ئەسرارێ حدوث .

| کورستانا مەرکەزی | آشیتنا | هەڤیرکا |
|---|---|---|
| بارام دێ نان بخوی | •• وێ نان بخوی | ئێ نانبخوێ |
| بارام دێ ایرو بچی | •• وێ ایرۆ بچی | ئێ ایرۆ چي |
| ئەم دێ بخـــون | •• ئەمێ بخون | ئەمێ خون |
| ئەم دێ بچن | •• ئەمێ بچن | ئەمێ چن |

## آورەك :

چه دەما ئەم ( هێ ـ پاشێ ، پشتي •• ) بدن بەرکرنا ( هێتي ) دور دبي :

ـ بارام هات لێ فەرهاد وێ ـ دێ هێبێ •
ـ وێ ، دێ بارام پاشێ بێ •
ـ دێ ، وێ بارام پشتی فرهاد بێ ••• •
: ـ هن دی ژي هەنه لێ ناخوازن درێژ بکن •
: ـ دشیوەی سۆری ده ( کرنا ناکا و هێتێ ) وەکه هەڤ تین ونیشانا وێ ( ئه ـ ده ) خویا دکن •

| | کرنا هێتێ | کرنا ناکا | نیشان |
|---|---|---|---|
| سلیمانی : | ئەخوم | ئەخوم | ئه |
| هەولێری : | دەخوم | دەخوم | ده |
| •• | ئەروام | ئەروام | ئه |
| •• | دەروام | دەرووەم | ده |
| •• | ئەخوات | ئەخوات | ئه |
| •• | دەخوات | دەخوات | ده ••• |

دڤرده ــ ناکا و هێتێ وەکە هەڤ هاتنە خویا کـرن • لجـەم خلکی سلیمانی ( ئە ) دپێش دە تێ ، ولجەم هەولێری‌یا ( دە ) دپێش دە تێ • وەلێ لجەم کورمانجا چاوا هاتە خویاکرن • ( د ) نیشانا کرنا ناکایە و ( دێ ) وێ ــ ئێ نیشانا کرنا هێتێ نە •

: ــ هەروها خـویا دکی کـو ( هێ ) ژبۆ دوری هاتیە • وەك ( س ــ سوف ) دزمانێ عربي دە تێ • پاشێ ، پەی رە ، پشترە • بداخوازا ( بعد ) هاتنە :

ــ دخوی • دێ بخوی ، دێ هێ بخوی •

ــ دخوی • وێ پاشـــێ بخوی ، وێ پەیرە بخوی ، وێ پشترە بخوی •••



## ( ٢ ) ــ ( فرمان ) ــ ( الامر ) •

: ــ فەرمان ئـەوە کو مرۆڤ ژبو بجیکرنا کارەکي فـەرمان لیەکي دی بکی و بێژی : بکە ــ مەکە •• •

## ئەوژی دو پەرچەیە :

١ ــ فەرمانا بکرنێ ــ مثبت
٢ ــ فەرمانا بنەکرنێ ــ منفی • وەك :

| فەرمانا بکرنێ | فەرمانا بنەکرنێ |
|---|---|
| ڤي ناني بخوە | ڤی ناني مەخوە ••• |
| ڤي کاري بکە | ڤي کاری مەکە ••• |
| ڤي ماری بکوژ | ڤي ماري مەکوژ • •• |

## آواك :

فەرمانا بکرنێ ئەگەر ژکارەتەکێ نە بێتر بي ( ب) دپێشيا وێدە تێ • وەك :

ــ بخوە ، بدە ، بکە ، بەردە ، بێژە ، بگرە

ــ بکوژ ، بمر ، برۆ ، بچە ، بلێ ، بێر •••

: ــ دڤا هەموادە ( ب ) نە ژکۆکا گۆتنێ یە • ژبۆ فەرمانە •

: ــ لێ ئەگەر ژ کارتەکێ بێتر بي وێ چاخێ هەبونا ( ب ) نەگەرەکە • وەك :

ــ رابە ، رونە ، رازە ، راکەڤ ، رادە

ــ هەرە ، وەرە ، فەرمۆ ، دەینە ، دەرخە •••

: ــ لێ د فەرمانا بنەکرنێ دە تیبا(مەــنە)دگەل تەڤا تێن •وەك :

ــ رامەبە ، رومەنە ، رامەزە ، رامەکڤ ، رامەدە

ــ مەرە ، مەوە ، مەچە ، مەخوە ، مەکە ، مەرۆ •••

ــ نەدە ، نەخوە ، نەبە ، نەرە ، نەوە ، نەکە •••

ــ رانەبە ، دانەزە ، دانەخە ، ڤێنەخە ، هل نەدە •••

دڤردە ــ هاتە زانین کۆ ژ کارتەکێ بێتر تیپا فرمان ( ب ) ژێرە نەگەرەکە وەك : وەرە ، هەرە ••

ــ هاتە زانین کۆ ( مە ــ نە ) دفەرمانا ب نەکرنێ دە تێن وەك :

ــ مەو ، مەر ، نەچ ، نەو •••

ــ مەدە ، مەرە ، نەچە ، نەوە •••

ــ هاتە زانین کۆ چە دەما خوردە پێشەك دبەردە بێ ( مە ــ نە ) دکەڤن پاش خوردە پێشێ • وەك :

ــ رامەکە ، رامەخە ، رامەدە ، رامەزە ــ ( را )

ــ دامەکە ، دامەخە ، دامەدە ، دامەکەڤ ــ ( دا )

ـ ڤێ مەخە ، ڤەمەدە ، ڤەمەخوە ، ڤەمەگەر ـ ( ڤە )
ـ هلمەدە ، هل مەکە ، هل مەگیف ـ ( هل )
وەها رەنگە چەدەما (مە ـ نە )بێن گەرەکە ب گۆتنێ ڤەبن • لێ
هن کورد ڤي آواي دشکێنن و دبێژن :
ـ نەڤەخوە ، نەرادە ، مەهلدە •••
ـ مە ڤەکە ، نەرابە ، نەدەینە •••

: ـ لێ دآورا مە دە یا پێشي راستە• ژبەرکۆ دەما تیپا (مەـ نە) بکەڤن ناڤبەرا ( آلاڤ )و گۆتنێ وێ چاخێ ئەم دزانن کۆ ( آلاڤ ) نەژ گۆتنێیە ، پاشێ تیپێ (ماندەلا ) گەرەکە راستا راستا بگۆتنێ ڤە بن • ژبەرکۆ دبەر چە کەڤن وی ددن ماندەلا • وەك :
ـ من نان نەخواريیە ـ ( خوارنا نان ) ددی ماندەلا •
ـ نەمن نان خوارییە ـ دڤردە ـ (من ) ددی ماندەلا •

ـ من نان نەخواريیە • بەلکی من تشتکی دی خواريیە • لێ نەمن نان خواريیە • دبي یەکي دی نان خواربي • خوە ژخوارنێ دپارێزی • بکورتي تیپا ( ماندەلا ) دبەر کیژان گۆتنی کەڤي وێ ددي ( ماندەلا ) •

## : ـ دیسا فەرمان دو پەرچەیە :

١ ـ فەرمانا ب ـ ین فەرەهي
٢ ـ فەرمانا ب ین تەنگی

: ـ نیشانا فەرمانا بین فەرەهي ئەوە کۆ ( ە ) بکەڤي داویا تەکێ وێ • وەك : ـ بکە ، بدە ، بخوە ، بەردە •••
ـ لێ ئەگەر داویا گۆتنێ تیپا دەنگی بي وەکە خوە دمێني :
برۆ ـ بلێ ، بچۆ ••• مەرۆ ، مەلێ ، مەچۆ •••

## فەرمانا سادە ببین فرەهی :

| فرمان بکرنێ | فەرمان بنە کرنێ |
|---|---|
| ڤي ماري بکوژە | ڤي ماري مەکوژە |
| ڤي ناني بخوە | ڤي نانی مەخوە |

فەرمانا پەرچیم ببین فرەهی :

| فەرمان بکرنێ | فەرمان بنەکرنێ |
|---|---|
| ل ڤر رونە | لڤر رومەنە |
| ژڤر رابە | ژڤر رامەبە |
| ڤي داني راخە | ڤي داني رامەخە |
| ل ڤر راکەڤە | لڤر رامەکەڤە |

## ـ فەرمان ببین تەنگی :

نیشانا فەرمانا ب بین تەنگی ئەوە کۆ داویا وێ گرێداي، یمیێي . وەك :

| فەرمان بکرنێ | فەرمان بنەکرنێ |
|---|---|
| ڤي ماري بکوژ | ڤي ماري مەکوژ ـ نەکوژ |
| ڤي نانی بوخ | ڤي ناني مەد ـ نەد |
| لسەر دوشەکێ رون | لسەر دوشەکێ رومەن .... |
| ڤي داري ژێك | ڤي ژێمەك ـ ژێنەك |

دڤردە هاتە زانین کۆ فەرمان بکرن و نەکرن هەیە وەك :

ـ بك ـ بکە مەر مەرە ...

هەروها هاتە زانین کۆ ببینا فەرە هەیە وببینا تەنگ‌هەیە . وەك :

ـ بەرد ، بکوژ ـ بەرمەدە ، مەکوژە ، نەکوژە •••

هاتە خویا کرن کۆ ( ب ) دوان فەرمانێ یەك کارت دەتێ• وەك:

ـ بد ـ بدە • بێژ ـ بێژە ـ بکوژ ـ برەڤ •••

هاتە زانین کۆ تیپێ ( ماندەلا ) دفەرمانێ دە ( مە ـ نە ) شوتا هەڤ دگرن ـ وەك : ـ مەد ، نەد ، بەرمەد ـ بەرنەد •••

هاتە زانین کۆ دفەرمانا پارچیم دە ( مە ـ نە ) دکەڤن تاڤ‌بەرا هەردو پەرچا وەك :

ـ رامەکەڤ ، دامەکەڤ ، ڤەمەخوە ، هل مەدە •••

ـ رانەکەڤ ، دانەکەڤ ، ڤەنەخوە ، هل نەدە •••

ـ نێرو مێ دفەرمانێ دە پەیدانابن •

: ـ آلاڤێ فەرمانێ ( با ـ بەلا ـ بەرا ) دپێشیا فرمانا تەپەندی دەتێن :

ـ بابرۆێ ، بانەخوي • بەلا نەچی ، بەلا نەخوي • بەرانەچی ، بەرا بخوی •••

ـ با نەرۆی ، بانەخوي • بەلا نەچی ، بەلا نەخوي • بەرانەچی ، بەرا نەخوي •••

دچیرۆکي دە تێ گۆتن : بابخوارا• بەلا بخوارا• بەرابخوارا بانەخوارا • بەلا نەخوارا ، بەرە نەخوارا • فرمانا چیرۆکي ئەوەکـۆ نیشـانا فەرمان دپێش دەبيو(آ)دپاش دە بي : داخوازیيە •(طلبي)يە



## ـ كۆم دكرنێ ده ( الجمع في الفعل ) :

: ـ بەري هەر تشتي گەرەكە ئەم زانبن كۆ دزمانێ كوردیدە
سەر یەكێ رە ( كۆمە ) • وەك :

## ـ كرنا تێپەر :

تەك ـ ١ ـ بارام نان خوار

| | |
|---|---|
| كۆم ـ ٢ ـ بارام و خورشید | نان خوارن • |
| كۆم ـ ٣ ـ بارامو خورشیدو فەرهاد | نان خوارن • |

تەك ـ ١ ـ بارام چو

| | |
|---|---|
| كۆم ـ ٢ ـ بارامو خورشیدو فەرهاد | چون |

## آواك :

ـ دكرنا تێپەرا بۆرى ده چه دەما بەرناڤ دگەل بن كرن وەكە-
خوە ( تەك ) دمێني • وەك :

ـ تە خوار ـ تە نان خوار

ـ مە خوار ـ مە نان خوار

ـ وی خوار ـ وا خوار ، ویٚ خوار ، وەخوار ..

دڤردە ـ ( خوار ) دهەموادە وەکە خوە مایە . تیٚدە ( کوٚم )و ( تەك ) ئەشکرانەبونە . هەر ( تەك ) مایە .
ـ لیٚ کوٚ بەرناف نە دگەل بن ( کوٚم ) و ( تەك ) تیٚدە ئەشکرا دبن . وەك :

## ب بەرناف

ـ من خوار ، مە خوار
ـ تە خوار ، وە خوار
ـ وی خوار ، وا خوار
ـ ویٚ خوار ، وا خوار

## ـ بیٚ بەرناف :

ـ خوار ـ خواریە خوارن ـ خوارنە
ـ بەردا ـ بەردایە بەردان ـ بەردانە
ـ کوشت ـ کوشتیە کوشتن ـ کوشتنە
: ـ بەلام دکرنا تیٚنەپەردە ( کوٚم )و ( تەك ) ژهەڤ خـویا دبن . وەك :

## ب بەرناف

ـ ئەز چوم ـ ئەز چومە ئەم چون ، ئەم چونە
ـ تو چـو ـ تو چـویە ون چون ، ونچونە
ـ ئەو چو ـ ئەو چویە ئەو چون ، ئەو چونە ..

## : ــ بێ بەرناف

ــ چوم ، چومە چون ، چونە
ــ چــو ، چویە •
دڤردە ــهاتە خویا کرن کۆ چــە دەما بەرناف دگەل کــرنێ بن ٦ پەرچەنە :
ــ ئەز چوم ئەم چون
ــ تو چــو ون چون
ــ ئەو چــو ئەو چون
لێ دەما بێ بەرناف بن (٣) پەرچەنە :
ــ چوم ، چون ، چو •
جارنا دبێژن : ( تو چوي ) لێ براستی ئەوە کۆ بێژن : ــتوچو:

## ــ نیشانێ کۆم دکرنێ دە

( آن ــ ان ــ اێن ــ اين ــ اون ــ ئۆن ) ٦ پەرچەنە وەك :

| | | |
|---|---|---|
| آن ــ | بارام و فەرزەندە | رازان ، پالدان •••• |
| ان ــ | شێرين‌و نەسرين | دخون ، دچن ، دکن •• |
| اێن ــ | آزادو فەرهاد | تێن ، دبێن ، دەلێن ••• |
| اين ــ | شێرين‌و نەسرين | دگرين ، بەزين ، رەڤين• |
| ئون ــ | زەنارو شێرۆ | چون ، رابون ، ددرون • |
| ئۆن ــ | شێرين‌و پەری | دشۆن ، دپۆن ، درۆن • |

## آورەك :

ــ ئەم کارن بێژن : ( ن ) تەنێ نیشانا کۆمە •

ئەڤێ دي هەمي تەڤگەرن •

تەڤگەر ژی دبي لگۆرا تیپا پێش خوە بێ • وەك :

ـ ( كر ) كرنەكە بۆرییە ، تەكە

ـ ( كرن ) ژێدەرە • تەڤگـەرا دناڤ بەرا ( ن ـ د ) دە لگۆرا ( ر ) هاتیە ، سڤكە • د ( لاتینی ) دە خوەش خویا دبي •

ـ لێ كۆ بەرێ تیپكە دەنگی دپێشدە بي وەكە خوە دمێني :

ـ چون ، رابون ، د درون •••

ـ بەزین ، دگرین ، رەڤین •••

: ـ هەر بڤی ( آوای ) ئەم دكارن بێژن : ( ن ) تەنێ نیشانە •

: ـ گەرەكە ژیرا مە نەچی كـۆ نیشانێ ( كۆم ) د ( ناڤ ) دە جیاوازن •

: ـ كۆم دكرنێ دە جارنا لگۆرا كرۆكو جارنا لگۆرا پێكراوتێ• جا ئەگەر كرۆك ئەشكراو ب تیپا پێوەند لپەی هەڤ هاتبن ، كـۆم دكرنێ دە لگۆرا كرۆك تێ • وەك :

ـ روستم و فەرهاد نان خوارن •

ـ روستمو فەرهاد چونو هاتن •••

ـ لێ دكرنا تێپەرا بۆری دە ، چە دەما كۆ ( بەرناڤ ) لشـونا ناڤێ ئەشكەرا تێن ، وێ چاخێ ( كرن ) لگۆرا پێكراو كۆم دبي وەك :

| | |
|---|---|
| من سێڤەك خوار | من سێڤن خوارن |
| تە سڤێەك خوار | تە سێڤن خوارن |
| وی سێڤەك خوار | وی سێڤن خوارن |
| وێ سێڤەك خوار | وێ سێڤن خوارن |
| مە سێڤەك خوار | مە سێڤن خوارن |
| وە سێڤەك خوار | وە سێڤن خوارن |
| وا سێڤەك خوار | وا سێڤن خوارن ••• |

ـ لێ چه دەما کۆ آلاڤێ نیشاندان پێرەبن وێ چاخێ ( سێڤ )
کۆ پێش ناڤە دروستە کۆ ( تەك ) و ( کۆم ) بي • وەك :

| | |
|---|---|
| تە ئەڤ سێڤ خوار | تە ئەڤ سێڤ خوارن |
| وە ئەڤ سێڤ خوار | وە ئەڤ سێڤ خوارن |
| وي ئەڤ سێڤ خوار | وي ئەڤ سێڤ خوارن |
| وا ئەڤ سێڤ خوار | وا ئەڤ سێڤ خوارن |
| وێ ئەڤ سێڤ خوار | وێ ئەڤ سێڤ خوارن |
| من ئەو سێڤ خوار | من ئەو سێڤ خوارن |
| مە ئەو سێڤ خوار | مە ئەو سێڤ خوارن •• • |

: ـ چاوا کۆ هاتیە دەرباسکرن چە دەما دو ( کۆم نیشـــان )
بـهەڤرە دکرنو ناڤ دە بـجڤن سەزایە کۆ یەك بێ آڤێتن • وەك :

سێڤێن مەخوەشن ـ سێڤی مە خوەشن
ئەم سێڤان دخون ـ ئەم سێڤا دخون
ڤان سێڤان بـخوە ـ ڤا سێڤا بـخوە ••

لێ جارنا ناچارە هەردو دمێنن • وەك :
ـ مە سێڤەك خوار ـ مە سێڤن خوارن •• •

: ـ وێ چاخێ ( ئەك ) و ( ان ) ژ بۆ دانزانینا تەكو کۆم تێنە
دانین ، یانيمەیەك سێڤ خوار • مە هنەك سێڤ خـوارن • لێ آڤێتنا
یەکێ گەرەکە • ژبەرکۆ هەرکەس دخوازی زمانێ خوە سڤك بکی •
گراني دزمانا دە کیما سیـیەکە مەزنە •

## ( ٤ ) ــ ديسا كرن دو پشكه :

١ ــ ئەرێ ــ مثبت
٢ ــ نا ــ منفي

: ــ كرنا ئەرێ ژ آلاڤو تيپێ ( ماندەلێ ) پاراستي‌يە • وەك :

ــ بارام چو بارام هات
ــ شێركۆ خوار شێركۆ خواريە •
ــ دلشا دلۆريني رەوشێ دناو رێني •••

دڤا تەڤادە تيپا ( ماندەلا ) پەيدانابي •
: ــ لێ دكرنا ب ( نا ) دە گەرەكە تيپا ماندەلا هەبي • وەك :

ــ بارام نەچو بارام نەچويە
ــ سەردار نەخوار سەردار نەخواريە
ــ نەسرين ناچي مزگين ناخوي •••

: ــ دڤردە هاتە زانين كۆ دماندەلێ دە كرنا ناكا و هێتێ يەكن يانى چە دەما دبێژن : ــ نان ناخوم • ئەم دكارن بێژن ــ نهاو هێتێ وەكە هەڤن • ژبەركۆ ( نان ناخوم ) دروستە : نهانان ناخوم‌و دروستە پاشێ نان ناخوم • و دروستە كۆ بێژن :ــ بجارەك نان ناخوم ، نە نها ونە دۆمەكە دی •••

: ــ لێ چە دەما كۆ بخوازن بدن زانين ناكا ــ يا دومەكە دی ، گەرەكە بێژن : ــ نها ــ ناكا ــ ڤێگا ــ ايستا ــ نهو •• نان ناخوم •

ــ يان بێژن : ــ پاشێ ــ دومەكە دی ژی ــ بجارە نان ناخوم•
ــ يان هيچ نان ناخوم ، نە نهاو نە گاڤەكەدی نان ناخوم •••
: ــ هەر بڤی آواي دكارن بدن زانين كۆ دماندەلا دە ( هێتێ )و ( ناكا ) وەكە هەڤ ددن ماندەلا •

## :ـ تيپێ ماندەلا ( ٣ ) نە

( نە ـ نا ـ نۆ )

### ١ ـ ( نە ) ژبۆ ماندەلا کرنا ( کرنا بۆری ) یە• وەك :

ـ نەخـوار ـ نەخواریيە ـ نەچـو ـ نەچویە •
ـ من نەخوار ـ من نەخواری‌یە ـ ئەزنەچوم ـ ئەزنەچومە•
ـ تە نەخـوار ـ تە نەخواری‌یە ـ تو نەچو ـ تونەچویە••
ـ ئەو نەچـو ـ ئەو نەچویە ـ وی‌نەخوار،وی‌نەخواری‌یە
ـ ئەم نەچون ـ ون نەچون ـ ئەو نەچون
ـ مە نەخـوار ـ وە نەخوار ـ وا نەخـوار
ـ وێ نەخوار ••• •••

### ٢ ـ ( نا ) ژبۆ نەکرنا ( هێتێ ) یە ـ کرنا دوملە وەك :

ـ ناخـوم ـ ناچم ـ ناکم ـ نابم ـ نادم••
ـ ناخـوی ـ ناچی ـ ناکی ـ نابي ـ نادي
ـ ناخـون ـ ناچن ـ ناکن ـ نابن ـ نادن

### ٣ ـ ( نۆ ) ژبۆ ماندەلا کرنا بەرسڤێ تێ • وەك :

یەك دپرسي‌و دبێژی : ـ گەلۆ سادۆ ل‌مالە ؟
دبەر سڤا وی دە آشیتا دبێژن : ـ نۆ • یاني نا •
ئەم دکارن بێژن : (نۆ ـ نا)یەکن ، لێ‌بشیوە ژهەڤ جدابونە•
:ـ ژبەرکۆ دوێ بەر سڤی دە ئەم کارن بێژن : ـ ( نا ـ نۆ )

ـ گەلۆ بارام لماله ؟ : ـ گوهدار دكارى بێژى : ـ نـاـو دكارى بێژى : ـ تۆ ـ لێ هەر دڤي آواي دە ـ دبەرسڤىدە •
ـ ژلەورا ئەم نكارن بێژن :ـبارام تۆچى ـلشونا بارام ناچى•
بارام نۆ چويە ، لشونا ـ بارام نەچويە •••
لێ ( نە ـ نا ) دبەرسڤێ دە شونا ( تۆ ) دگرن •••
: ـ ( نە ) لجەم سورا دكەڤي پێش بەرناڤ دكرنا بۆرى دە :
ـ نانم نەم خواردوە •••
ـ آوم نەم خواردىيەوە •••
لجەم كورمانجا دكەڤي بەر كرنێ دڤا پەيڤا دە • وەك :
ـ من نان نەخوارىيە •••
ـ من آڤ ڤە نە خوارىيە •••
( م ـ م ) دكورمانجى دە هاتنە آڤێتنو ( من ) تەنێ كەتبە پێش پەيڤى ـ كرۆكە ـ دەستپێكراوە • (نە) راستا راستاكەتيە بەر كرنێ•
: ـ دەرباس بويە كـۆ ( نە ) بكـەڤي بەر ( چـە ) وى ددى ماندەلا :
ـ مە نان نەخوارىيە •
ـ مە نە نان خوارىيە •
ـ نە مە نان خوارىيە •
: ـ ديا يەكەم دە ( خوارن ) ددى ماندەلا • ديا دوەم دە (نان ) ددى ماندەلا • ديا سـيەم دە ( مە ) ددى ماندەلا •
( ١ ) ـ خوارن چێ نەبويە
( ٢ ) ـ نان نە هاتيە خوارن ـ دبي تشـتكى دي خواربي•
(٣)ـ(من) نان نەخوارىيە ، لێ دبييەكيدىنان خواربي،
وێ چاخێ نان هاتيە خوارن لێ نەمن خوارىيە ـ يەكـى دى خوارىيە •
ـ ( نيە ـ نينە ـ تونە ـ نەهن ) ـ

آورەك : ــ ئەڤ هەرچار ( آلاڤ ) هەروەكو دەرباس بونە ، ن جەم‌کورمانجا دپاش دە تێن،وداخوازێ‌بجارەك‌ددەن(ماندەلا)وەك:

ــ نان نیە ــ نان نینە ــ نان تونە ــ نان نەهن ٠

دڤا هەموادە ددی زانین کۆ ( نان ) بجارەك نیە ٠ لێ دەما ئەم بخوازن پەسنەکی بدن (ماندەلا ) ( نە ــ نا ) تێنە گـۆتن : ــ نان نەخوەشە ٠ رۆژ نەگەرمە ٠ یاني نان هەیە لێ نەخوەشە ٠ رۆژ هەیە لێ نەگەرمە ٠ خوەشیو گەرمي ددن ماندەلا ٠



## ( ٥ ) ــ پەرچە کرنا ( کرنێ ) :

: ــ کرن ــ بدو آوا تێ پەرچە کرن :

١ ــ دگل بەرناڤ

٢ ــ بێ بەرناڤ

: ــ کرن دگەل بەرناڤ :

ــ د تێزبۆری ــ دیتی دە دو پەرچە ( کرن ) هــەنە :

ــ خوار

ــ خوارن ٠ وەك

| | |
|---|---|
| من نان | ــ خوار |
| تە نان | |
| وی نان | |
| وێ نان | |
| مە نان | |
| وە نان | |
| وا نان | |

من سێڤ
تە سێڤ
وی سێڤ
وێ سێڤ — خوارن
مە سێڤ
وە سێڤ
وا سێڤ

دکرنا دور بۆری ـ نە دیتی دە :

مە ـ وە ـ وا ـ
من ـ تە ـ وی ـ وێ | نان خواریە

من ـ تە ـ وێ ـ وی
مە ـ وە ـ وا ـ | سێڤ خوارنە ...

## : ـ دکرنا چیرۆکی دە :

من ـ تە ـ وی ـ وێ
مە ـ وە ـ وا .. | نان خواربو

من ـ تە ـ وی ـ وێ
مە ـ وە ـ وا .. | سێڤ خواربون

## : ـ لێ دکرنا تێنەپەر دە ( ٣ ) پەرچەنە :

## : ـ نێز بۆری ـ دیتی :

ئەز ـ چوم ـ هاتم ...
تو
ئەو | چو ـ هات

## دور بۆری ــ نەدیتی :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەز | ــ | چومە | ــ | هاتمە ... |
| تو ، ئە | ــ | چویە | ــ | هاتیە |
| ئەم ، ون ئەو | ــ | چــونە | ــ | هاتنە ... |

## ــ چیرۆکی :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەز | ــ | چوبوم | ــ | هاتبوم .. |
| تو ، ئەو | ــ | چۆبو | ــ | . هاتبو . . |
| ئەم ، ون ، ئەو | ــ | چوبون | ــ | هاتبون... |

آورەك : دڤردە ( ئەو ) ( ٣ ) دەلامەتا دبێني :

١ ــ یەکێ نەپەندی

٢ ــ یەکە نەپەندی

٣ ــ هنە نەپەندي

هروها دڤردە ( ٣ ) پەرچە ( کرن ) دگەل ( ٥ ) پەرچە بەرناف تێن .

## ٢ ــ بێ بەرناف ــ

: ــ دکرنا تێپەرا بۆری دە ( ٢ ) دو پەرچە دمێنن :

| | | تەك | کۆم |
|---|---|---|---|
| نێز بۆری | ــ | خوار | خوارن |
| دور بۆری | ــ | خواریە | خوارنە |
| چیرۆکی | ــ | خواربو | خواربون. |

: ــ دكرنا تێ نەپەرا بۆری دە ( ٣ ) سێ پەرچە دمێنن :

| | |
|---|---|
| ئێز بۆری : ــ | چـوم ــ هاتم •<br>چـو ــ هات •<br>چـون ــ هاتن • |
| دور بۆری : ــ | چـویە ــ هاتیە •<br>چـومە ــ هاتمە •<br>چـونە ــ هاتنە • |
| چیرۆكی : ــ | چـوبوم ــ هاتبوم •<br>چـوبو ــ هاتبو •<br>چـوبون ــ هاتبون • |

: ــ لێ دكرنا ( ناكا )و ( هێتێ ) دە ، چەتێپەرو چە تێ نەپەر چە دگەل ( بەرناف ) و چەبێ ( بەرناف ) هەر ( ٣ ) سێ پەرچەنە :

## : ــ كرنا ناكا دگەل بەرناف

| بەرناف | تێپەر | تێنەپەر |
|---|---|---|
| ئەز | دخوم ــ | دچم |
| تو<br>ئو | دخوی ــ | دچي |
| ئەم<br>ون<br>ئەو | دخون ــ | دچن ••• |

## :ـ كرنا ناكا بێ بەرناڤ :

| بەرناڤ | تێپەر | تێنەپەر |
|---|---|---|
| ... ـ<br>...<br>... | ـ دخوم<br>ـ دخوي | ـ دچم<br>ـ دچي |
| ...<br>...<br>... | ـ دخون | ـ دچن .. |

## :ـ كرنا هێتێ دگەل بەرناڤ :

ئەزدێ بخوم ـ ئەزدێ بچم .

| | |
|---|---|
| تو<br>ئەو | دێ بخوي ـ دێ بچي |
| ئەو<br>ئەم<br>ون | دێ بخون ـ دێ بچن ... |

## :ـ بێ بەرناڤ

... ـ دێ بخـوم ـ دێ بچم ..

| | |
|---|---|
| ...<br>...ـ | دێ بخـوي ـ دێ بچي ... |

...
... دێ بخـون ـ دێ بچن ..
...

:: ـ دسوراني ده (٦) پەرچە دگەل بەرناڤو بێ بەرناڤ دمێنن:

## : ـ كرنا بۆرى تێپەر :

## ـ نێز بۆرى : دگەل بەرناڤ :

| | | | |
|---|---|---|---|
| تەك ـ | ئەمن خـواردم | ـ | ئەمن كردم ... |
| | ئەتو خـواردي | ـ | ئەتو كردي ... |
| | ئەو خـواردي | ـ | ئەو كردي ... |

| | | | |
|---|---|---|---|
| كۆم ـ | ئێمە خـوادمان | ـ | ئێمە كردمان ... |
| | ئێوە خـواردتان | ـ | ئێوە كردتان ... |
| | ئەوان خـواردیان | ـ | ئەوان كردیان ... |

## ـ دور بۆرى دگەل بەرناڤ :

| | | | |
|---|---|---|---|
| تەك ـ | ئەمن خـواردومەوە | ـ | ئەمن كردومەوە .. |
| | ئەتو خـواردیتەوە | ـ | ئەتو كردیتەوە .. |
| | ئەو خـواردیەوە | ـ | ئەو كردیەوە .. |

| | | |
|---|---|---|
| تەك ــ | ئێمە خــواردمانەوە ــ ئێمە كردمانەوە •• | |
| | ئێوە خــواردتانەوە ــ ئێوە كردتانەوە •• | |
| | ئەوان خــواردیانەوە ــ ئەوان كردیانەوە •• | |

| | |
|---|---|
| كۆم ــ | ئێمە خــواردمان بو ــ ئێمە كردمان بو •• |
| | ئێوە خــواردتان بو ــ ئێوە كردتان بو •• |
| | ئەوان خــواردیان بو ــ ئەوان كردیان بو •• |

: لێ بەرناڤێ پێشــگر بێنە راكرن ، بەرناڤێ پاشــگر دمێنن ژبەر ڤي آواي دیسا ( ٦ ) پەرچە ( كرن ) دمێنن :

: ــ نێز بۆری | خواردم ، خواردیت ، خواردی
خواردمان ، خواردتان ، خواردیان •

: ــ دور بۆری | خواردمەوە، خواردیتەوە ، خواردییەوە
خواردمانەوە ، خواردتانەوە، خواردیانەوە

: ــ چیرۆكی | خواردبومەوە ، خواردبوتەوە ، خواردیبوتەوە
خواردمانبو ، خواردتان بو ، خواردیان بو •

## آورەك :

ــ دسۆرىدە وەكە كورمانجی ( خوار ) كۆ ( كرنە ) وەكــەخوە دمێني تەنێ بەرناڤێ پاشــگرێ سۆری دگــەل ( كرنی ) دمێنن ژلەورا ( كرن ) دناڤ وان دە خوە وندا دكی شەپەرزە دمێني •

: ـ لێ ئەگەر ئەو بەرناڤ بێنە آڤێتن وەکە کورمانجی دمێني :
سۆرانی : ـ ئەمن خــواردم من خواردم ـ خواردم
کورمانجی : ـ من خــوار ـ مە خــوار •
: ـ دیا پێشي دە ( ئە ـ د ـ م ) زیدەنە • دیا ناڤێ دە ( د ، م ) زیدەنە • یا داوی دە ( د ) زیدەیە •
ـ کەنگی ئەم ڤا زیدە بونا راکن وەکە هەڤ دبن :

کورمانجی

ـ من خوار ـ من کوشت
ـ من خوار ـ من کوشت

سۆری

ـ من خوار ـ من کوشت
ـ من خوار ـ من کوشت
ـ خــوارم ـ کوشتم ( ؟ )

تەنێ دیا پاشي دە بەرناڤ لپاش دمێني•چاوا کۆ دکورمانجیدە لپێش دمێني • لێ دهەر روی ماي دە وەکە هەڤن •

: ـ ئەڤ ( دکرنا ) ( دالي ) دەولویە لێ دئێ مایدە گرانیا زیدە بونا ( د ) دسۆرانيدە نامێني • لێ ماینا دو بەرناڤا وەکە خوە دمێني
: ـ جارنا ( ە ) تەڤگەر زێدە دمێنن :
سۆراني : ـ ئێمە نانمان خواردمانەود •
کورمانجی : ـ •• مە نان •• خواریە •

: ـ وێ چاخێ ( ئێ ـ مان ـ دمانە ـ وە ) ـ ٤ ـ ٥ •زیدە دمێنن • ئەگەر بێنە آڤتن دمێني :

سوری : ــ مه نان خواروه
کورمانجی : ــ مه نان خواریه
( وه ــ یه ) دو تەڤگەرن ل‌گۆرا دەنگی تیپا بەری خوه تێنه‌دانین : دسۆرانی ده ( ر ) د( خوار ) ده پێشبەره‌که کـورت دانێ • ودکورمانجی‌ده ژێربەره‌که کورت دانێ • ژلەورا دسۆرانی‌ده تەڤگەرا پاش ( وه ) هاتی‌یه • ودکورمانجی‌ده ( یه ) • دتیـینا ( لاتینی ) دەگەلەك خوەش خویا دکن •

ــ وا دیاره که نەوەکهڤی دبەرناڤا ده ( زۆر ــ کەلەك ) دناڤ بەرا هەردو شیوادە پەیدا دبي :

١ ــ بەر ناڤێ سۆری : پێشگرو پاشگرن •
٢ ــ بەرناڤێ کورمانجی پێشگرن •
٣ ــ دپێشگرێ سۆر ده ( ئه ــ ئێ ) زیدەنه •
٤ ــ دکورمانجی‌ده پەیدانابن ــ نەمانه •
٥ ــ بەرناڤێ کورمانجی دو پەرچەنه نەوکه هەڤن •
٦ ــ دسۆری‌ده دو پەرچەنه دپێش‌و پاش‌ده وەکه خـوه دمێنن •

: ــ دکرنا تێ‌نەپەرێ سۆری‌ده ( ٥ ) پەرچه دمێـن کۆ بەرناڤ رابن :

## ــ دگل بەرناڤ ( ٦ )

ــ من چوم ، ئێمه چون ــ ئەتۆ چویت ، ئێوه چوین •
ــ ئەو چو ، ئەوان چون •

## ــ بێ بەرناڤ ( ٥ )

ــ چوم ، چویت ، چوي ، چوین ، چون

## :ـ دكرنا ( دودەم ) دە ( ٣ ) پەرچە دمێنن :

سليماني ـ ئەچم ، ئەچي، ئەچن •

هەولێری ـ دەچم ، دەچي ، دەچن •

## :ـ دفرمان دە ( ٤ ) پەرچە دمێنن :

سليماني ـ ئەبي بچم ، ئەبي بچن ، ئەبي بچيت ئەبيبچي ،

هەولێری ـ دەبي بچم، دەبي بچين، دەبي بچيت، دەبيبچي،

## تەنێ د ( سوتن ) دە وەكـە هڤالێ خـوە نایێ لێ نزانم چما ؟ ( ٥ ) پەرچەنە :

سوتام ، سوتاي ، سوتا ، سوتاين ، سوتان •••

دڤردە ( سوتا ) بێ ( راناوە ) •

## تەكا :

ئەگەر شاشي وچەوتي دڤان ئڤيساران دە پەيدا دبي تەكا ئەكەم لێم ببۆرن ، ژبەركۆ باش بشيوەي سۆری فێرنەبومە • پياوی چاك ئەوە كە شتيكی خوار ببێنی راست بكی •••

★ ★ ★

## ( ٦ ) ـ چاوا كرنا تێنەپەر دبي تێپەر ؟

**١ ـ چەقا تێ نەپەرێ كـوّ داوىيا وى ( آ ) بي ب ( آند ) دبي تێپەر :**

ـ گۆشت كەليا ـ من گۆشت كەلاند
ـ رون قەليا ـ من رون قەلاند
ـ شيرین رەڤيا ـ من شيرین رەڤاند
ـ دار هەژيا ـ من دار هەژاند
ـ كەو پەرتێ ـ من كەو پەرتاند ...

**٢ ـ چەقا كرنا كۆ ( بو ) بكەڤێ داويا وێ ب ( كر ) دبي تێپەر :**

ـ فەرهاد سواربو ـ من فەرهاد سواركر
ـ بارام رابو ـ من بارام راكر
ـ بار خواربو ـ من بار خوار كر
ـ كەروان كاربو ـ من كەروان كاركر
ـ بوك پەيا بو ـ من بوك پەياكر
ـ آلا بلند بو ـ من آلا بلند كر ...

**٣ ـ چـەقا كرنا داوىيا وێ ب ( كـەت ) بێ • ( بـخست ) و ( كر ) دبي تێپەر :**

ـ بۆزۆ داكەت ـ من بۆزۆ داخست •
ـ سۆرۆ راكەت ـ من سۆرۆ راكر
كارێ مە خەراب كەت ـ مە كارێ خوە خەراب كر ـ خست
ـ آگرێ مە ڤێكەت ـ مە آگرێ خـوە ڤێخست ...

# ( ٧ ) ـ كرنێ كێم وەش‌و آليكار :

هن كرن هەنە كوژواره دبێژن : كرنێ كـێم وەش‌و آليـكـار •
ژوا كرنا :

١ ـ ( بو ) يە • ئەڤ ( بو ) بداخوازا ( كان ـ صار ) دزمـانێ عربي‌دە تێ • لێ چاوا ژ هەڤ جدا دبن ؟

: ـ دزمانێ كوردی دە وەكە هەمو زمانێ دنیاي ( نەقره ) هەيە گەلەك جارا ( گۆتن ) ب ( نەقره ) ژهەڤ خويا دبن •

ـ جا چە دەما ئەم بێژن :

ـ بوك سوار بو •

ئەگەر ( نەقره ) لـسەر ( سوار ) بي • وێ چاخێ بداخوازا (كان) تێ • لێ ئەگەر ( نەقره ) لـسەر ( بو ) هات • وێ چـاخێ بداخـوازا ( صار ) تێ :

بارام سوار ( بو )

: ـ ( صار راكبا ) •••

بارام ( سـوار ) بو ـ دەما هات كوشتن •••

: ـ كان راكبا عندما قتل ••

: ـ خوارن چێبو ـ صار الاكل جيدا • بمعنى : طبخ جيدا •••

: ـ رەوشێ بـمێربو من رەڤاند ـ كانت متزوجة •

: ـ يانی ( پێـكراو ) ناخوازی ، بەلـكی دو ناڤا داخوازی :

بارام سـوار بو ـ بارام بو سـوار •

دڤردە ( سـوار ) نە پێـكراوە • ژبەركۆ ( كرن ) ژبارام نەچـويە سەر ( سـوار ) • بەلـكی ( بارام ) بويە ( سـوار ) •

ـ لێ د ( ژێدەر ) دە ( بو )و ( سـوار ) بـهەڤرە تێن‌و ژێدەركی چێدكن • ( سـواربون ) • ژبەركۆ ( بو ) كێم وەشـــە دبي ناڤـەك دگەل‌بێ • وەك :

سواربون ــ خواربون ــ پيابون
زانه بون ــ چێبون ــ خوەش بون ...
: ــ ژبەر ڤی ( آوای ) هن زمان زانێ کورد
( سواربو ) بهەڤره دکـــن ( کرنەك ) .
لێ نەکرنەکه . بەلکی دژێدەر تەنێده بهەڤره کۆم دبن . ژبەر کۆ ( بون ) بخوه ( ژێدەره ) چێکرۆخەچه ناڤي بدی بەر ، ژێدەرکی نو چێدکي :
( بون ) ــ سوار بون . خوەش بون
چێ بون . گران بون ...

## آورەك :

دڤرده ( ن ) نیشانا ژێدەره . نەژبۆ ( کـــۆمه ) . چەدەما ژبـــۆ ( کۆم ) بێ گەرەکه کۆمەك ناڤ دپێش ده هەبن :
ــ فەرهاد و رزگۆو شێرۆ سواربون .
ــ شێرینو مزگینو دلشا خوشكبون .
ــ شەش کیلۆ سێڤ بمن گران بون .
۲ ــ ( کر ) دو پێکراوا دخوازي :
ــ روستەم بوك سوار کر .
ــ فەرهاد بارێ خوه بار کر .
ــ شێرین پورێ خوه حەنه کر .
: ــ دڤرده ( بوك ) و ( سوار ) دو ناڤن ــ پێکراون . چاواکـــۆ ( پۆر ) و ( حەنه ) دو ناڤن ــ پێکراون ...

## آورەك :

جارنا ب تیپا پێوەند دو ناڤ دپێشیا ڤا هەردو کرنا دەتێن وەك :

ــ فەرهاد قەنجو خوەشکر دژمن کوشت •
ــ شەڤادي لگوندی مە : ــ گوڤەندو شاهی بو •
: ــ ژڤان پێڤە ژی هن آلاڤێ آلیکار هەنە کو چێکرۆخن وەك :
(را ، دا ، ڤە ، لا ، هل)
(را ) ــ رادا ــ راکر ــ راخست ــ رابو •••
(دا ) ــ دادا ــ داکر ــ داخست ــ دابو •••
(ڤە ) ــ ڤەدا ــ ڤەکر ــ ڤێخست ــ ڤەبو •••
(لا ) ــ لادا ــ لاچو ــ لابر ــ سۆرییە •••
(هل ) ــ هلدا ــ هلکر ــ هلبو •••
: ــ ئەڤ آلاڤ داخوازێ دگۆرنو ( کرنەکە ) نو چێ دکن :
هەوەکو : ( دا ) کرنەکە ــ دانەکە بێ ڤەگەرە •
ــ بارام نان دا ••
لێ کۆ ئەم بێژن : ــ ( رادا ) کرنەکە نو چێبو ــ دانەکە بڤەگەرە :
ــ شێرین جاوێ خوە رادا •
ــ سەرتیپ لنگی خوە رادا •
: ــ داخواز هاتە گۆراندن ، ( رادان ) نەوەکە ( دان ) ە •
وەها رەنگە ئەڤێ دی ژی ولونە • کۆربالا خوە بدی :
ــ دا ــ دادا ــ داکر ــ داخست
هەر یەك داخوازەك هەیە • نەوەکە هەڤن ••••
لێ ( رە ، ڤە ، دە ) دپاش پەیڤێ دەتێن :
ــ د ڤر ( ڤە ) وەرە ، دڤر ( ڤە ) هەرە •••
ــ دڤر ( رە ) وەرە ، دڤر ( رە ) هەرە •••
ــ دڤر ( دە ) یە ، دور ( دە ) یە •••
: ــ دڤردە ژبۆ نیشاندان و بجیکرن هاتنە •

## آوره‌ك :

دسۆرانيده (وه) شونا (ڤه)دكرى،چاوا خويادكى (ڤه)دكوكاخوه ده (وه) يه . لێ پاشێ بويه (ڤه) هه‌م سينۆرى مه : تركو فارسو ئه‌رمن، ژى (وه) ب (ڤه) گوراندنه و دبێژن :

ترك ــ وار ــ ڤار
فارس ــ دوه‌م ــ دڤه‌م
ئه‌رمن ــ ئه‌ورپا ــ يه‌ڤرپا ...

كورد ژى ولو زمانێ خوه سڤك كرنه و گۆتنه :
سۆراني : ــ گه‌را وه ــ گه‌رايه‌وه ــ گه‌رايه‌ته‌وه ...
بهديني : ــ گراڤه ...
كورمانجى : ــ ڤه‌گه‌رايه ...
: ــ وا دياره كۆ (ڤه ــ وه) لجه‌م سورا و به‌هدينا دپاشــده هاتنه . لێ لجه‌م كورمانجى ماي دپێش (كرنێ) ده‌تێ .
: ــ دكورمانجيده دهه‌مو كرناده ناي .
٦

| سورانى | | به‌هدينى | | كورمانجێ ماي |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| هاتيه‌وه | ــ | هاتيه‌ڤه | ــ | هاتيه . |
| خواردوه | ــ | ... | ــ | خوارى‌يه |
| ره‌وشتووه | ــ | ... | ــ | چويه . |
| دانشتووه | ــ | ... | ــ | رونيشيه ... |

## : ــ دناڤ ده :

سۆرانى ــ له اێره‌وه وه‌ره
بهدينى ــ دهره‌ڤه وه‌ره

: ــ دسۆرانيده ( وه ) بدوسیٚ داخوازا تیٚ :
١ ــ دور بۆری :
٢ ــ ب جیکرنو نیشاندانا دەرەك ــ شونەك •
٣ ــ ژبۆ خوارنا تشتی رۆن • وەك آڤو ••
ــ رەوشتووه ــ کردوه ــ بردوه •••
ــ گەرایەوه ــ هاتیەوه ــ چويتەوه •••
ــ خواردیەوه ــ •••

: ــ لیٚ دکورمانجی ده هەروەکو هاتیە زانین ئەڤ ( وه ) بویە ( ڤه ) • بەلام پری جارا لجەم کورمانجا دپیٚشده تیٚ :
ــ ڤەگەرایە ــ ڤەبویە ــ ڤەخواریە ــ ڤەرستیە ••
تەنیٚ ئەگەر ( د ) بکەڤیٚ پیٚشیا پەیڤیٚ ویٚ چاخیٚ ( ڤه ) دپاشده تیٚ : ــ ئەگەر ژ سلیماني هاتي د خانەقین ڤه وەره • ــ ئەگەر هەری زاخۆ د موسل ڤه هەره •••
: ــ بسۆراني جارنا تیٚ گۆتن : ( هاتوتەوه ) :
هەروەکو ژمن ڤەخویا بو ، ئەڤ ( ته ) زیٚدەیە • لیٚ ژبەرکۆ دو ( و ــ و ) بهەڤره کۆم نەبن ناچاره ( ته ) زیٚده کرنه •

سۆراني : ــ هات ــ هاتوه ــ هاتوتەوه •••
بەهدیني : ــ هات ــ هاتیه ــ هاتیەڤه •••
کورمانجي ماي : ــ هات ــ هاتیه ••••
: ــ کەنگی ئەم دبیٚژن : ــ هات ــ هاتیه • تیٚ زانین کۆ هاتیە کو ؟ پاش ڤه دانینا ( وه ــ ڤه ) أیدی نەگەرەکە ــ پیٚویستنیه • ویٚ چاخیٚ : ( وه ــ ڤه ) دپاشده زیٚدەنه •
: ــ چاوا ئەم زانن کۆ ئەڤ ( ه ) : ( را ، دا هل ، لا ، ڤه ) نەژ کۆکا گۆتنیٚنه ؟
: ــ چه دەما کۆ تیپەك ( ماندەلا ــ نفی ) بکەڤی پیٚش گۆتنیٚ

تێ زانین کو ئەڤ ( ە ) تیپ نە ژکۆکا وێنە • ژبەرکو تیپا (ماندەلا ) دکەڤێ ناڤبەرا ڤا تیپاو گۆتنێ وەك :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| رادا | ـ | رانەدا | • | رازا | ـ | رانەزا••• |
| دادا | ـ | دانەدا | • | دامەدە | ـ | دامەگرە ••• |
| لابرد | ـ | لانەبرد | • | لاچو | ـ | لانەچو ••• |
| هلکر | ـ | هل نەکر | • | هلبو | ـ | هل نەبو ••• |
| ڤەکر | ـ | ڤە نەکر | • | ڤەبو | ـ | ڤە نەبو ••• |

: ـ وێ چاخێ ب هەساني تێ زانین کو ئەڤ ( کرن ) پەرچیم و لێکدارون •

: ـ هەروها دکرنا ناکادە ( د ) کو نیشانا ( کرناناکا )یە ، دکەڤێ ناڤبەرا آلاڤو ( کرنێ ) وتێ گۆتن :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| رادزم | ـ | رادکم | ـ | رادخم | ـ | رادبم ••• |
| رانازم | ـ | راناکم | ـ | راناخم | ـ | رانابم ••• |
| ڤە دخوم | ـ | ڤە دکم | ـ | ڤە ددم | ـ | ڤە درێسم •• |
| ڤە ناخوم | ـ | ڤەناکم | ـ | ڤە نادم | ـ | ڤە نارێسم •• |
| لائەدم | ـ | لائەچم | ـ | لائەبم | ـ | لائەخم ••• |
| لانادم | ـ | لاناچم | ـ | لانابم | ـ | لاناخم ••• |
| هل ددم | ـ | هل دکم | ـ | هل دکشم | ـ | ••• |
| هل نادم | ـ | هل ناکم | ـ | هل ناکشم | ـ | ••• |
| داددم | ـ | دادخم | ـ | دادکم | ـ | ••• |
| دانادم | ـ | داناخم | ـ | داناکم | ـ | ••• |

ژبەرکو ( د ) گەرەکە دبەر ( کرنێ ) دەبێ • چاواکو تیپا ( ماندەلا ) ژی ولۆیە •

## :ـ كرنا دو رەھ :

:ـ هن ( كرن ) هـەنە كـۆ دوان دە : ( بۆری ) ، ( ناكا ) ، ( هێتێ ) نەوەكە هەڤ تێن • ژوان رە دبێژن :ـ كـرنێ دورەھ ـ دورەگ •            وەك :

| ژێدەر | | بۆری | ناكا | هێتێ |
|---|---|---|---|---|
| فرۆتن | :ـ | فرۆت | دفرۆشي | دێ بفرۆشي |
| دۆتن | :ـ | دۆت | ددۆشي | دێ بدۆشي |
| كوشتن | :ـ | كوشت | دكوژی | دێ بكوژي |
| براشتن | :ـ | براشت | دبرێژی | دێ ببرێژي |
| راكەتن | :ـ | راكەت | رادكەڤی | دێ راكەڤي |
| داكەتن | :ـ | داكەت | دادكەڤی | دێ داكەڤي |
| هاتن | :ـ | هات | تێ | دێ بي |
| آڤێتن | :ـ | آڤێت | تاڤێژی | دێ باڤێژی |
| مێتن | :ـ | مێت | دمژی | دێ بـمژی |
| رێتن | :ـ | رێت | درێژی | دێ برێژی |
| گۆتن | :ـ | گۆت | دبێژی | دێببێژی |
| گۆتن | :ـ | گۆت | ئەلێ | دەلێ ( سۆری ) |
| گۆتن | :ـ | گۆت | دبێ | دێ ببێ ••• |

:ـ دڤا تەڤادە كرنا ناكا و هێتێ وەكە ژێدەرێ خوە نائێن • لێچە دەما هورو كۆر لێ بكۆلن دبینن كۆ ژبۆ سڤكیو بـهەڤ شاش نەبون هاتنە گۆراندن •

●

## :ـ بجي كرن ـ ( تاكيد ) دكرنێ ده چاوايه ؟

:ـ ژبۆ كۆ دلێ گوهدارێ ته بكـهڤي جي ـ باوەر بكـى ، گەرەكه ( كرن ) دوجار بێ گۆتن •

:ـ بێ وەكو مرۆڤەك ب پرسيو بێژى :
ـ راسته بارام ژ ( رەواندزێ ) هاتيه ؟

دبرسڤا وى ده تێ گۆتن : ـ بەلێ هاتيه •
ـ لێكۆ باوەر نەكي و جارەكه دي بپرسي و بێژى :
ـ خوه دێكى دەبێژه : راسته هاتيه ؟

دبرسڤا وىده ڤێ جارێ تێ گۆتن :
ـ بەلێ بەلێ هاتيه

يا ـ بەلێ ، هاتيه هاتيه •••

يانى بجي هاتيه • باوەربكه هاتيه •••
:ـ وها رەنگه : ـ چويه چويه • وێبێ وى بێ • نايێ نايێ••

:ـ لێد ( ناف ) ده ، جارنا ئەو ناڤێ كۆ ( م ) د سەرێ وى ده نەبي ( م ) مەك دكەڤێ سەرێ وى وتێ گۆتن :

ـ ئەز شێخ مێخ نزانم •••
ـ آغا ماغا ناس ناكم •••
ـ بەگ مەگ گوه نادم •••

:ـ وها رەنگه دبێژن : فلان بێڤان نزانم •••
:ـ لێ ئەگەر ( م ) دسەرێ ( ناف ) ده هەبي ، وێ چاخێ ئەم نكارن بێژن : ـ مەلا مـەلا نزانم ••• لێ دبێژن : ـ مەلا نەمـلا نزانم • مێر نەمێر نزانم • مير نەمير ناس ناكم •••

:ـ لێ بجي‌کرنا براستی ئەوە کۆ ( کرن ) یا ( آلاڤ ) دوجار بێ گۆتن :

ـ نانا بارام نەچویە ...

ـ بەلێ بارام چویە چویە ...

★ ★ ★

## :ـ رەوش‌و پەرگالا کرنێ ـ ( وضع الفعل )

:ـ ( کرن ) بخوە ناڤێ ( ژێدەرە ) لێ کۆ ئەم نیشانا (ژێدەر ) باڤێژن ب ( آوایێ ) دەمێن خوە دبي ( ٣ ) پەرچە :

١ ـ کرنا بۆری

٢ ـ کرنا ناکا

٣ ـ کرنا هێتێ .

## ـ کرنا بۆری ژی ( ٤ ) پەرچەیە :

١ ـ نێز بۆری ـ دیتی .

٢ ـ دور بۆری ـ نەدیتی .

٣ ـ خوەستي ـ ( طەلبي ) .

٤ ـ چیرۆکي ـ (مبني الحکایە )

## :ـ چیرۆکي ژي دو پەرچەیە :

١ ـ چیرۆکی دیتی ـ ( شهودی )

٢ ـ چیرۆکی نەدیتی ـ ( غیر شهودی )

★ ★ ★

:ـ ئێ‌کۆ دکی ناڤێ وی ( کرۆکە ) . ئێ‌کـۆ ( کرن ) پێ دبي ناڤێ وی ( پێکراوە ) .

: ــ خوه پێ گرتيێ ( كرنێ ) جيدهم ــ جيگه ــ ( راكێشــ‌و راكێشراون ) •
: ــ هه‌ريه‌ك ژڤان دورو درێژ دجهێ خوه ده هاتنه گۆتن •

★ ★ ★

## : ــ رەوش‌و تەڤگەرێن داويا كرنێ :

چاوا هاتيه خويا كرن ( ٧ ) رەوش‌و ( ٦ ) تەڤگەر دكەڤن داويا ( كرنێ ) وەك :

| | | هەرێ | نا | تەڤگەر |
|---|---|---|---|---|
| ژێدەر | : | كرن | نەكرن | ( ان ) |
| تێز بۆری | : | كر | نەكر | گرێداي |
| چيرۆكیديتی | : | دكر | نەدكر | •• |
| دور بۆری | : | كريە | نەكريە | ( يە ) |
| چيرۆكی نەديتی | : | كربو | نەكربو | ( بو ) |
| خوەستی | •• | بكرا | نەكرا | ( آ ) |
| ناكا | : | دكي | ناكی | ( ی ) |
| هێتێ | : | دێ بكی | دێ نەكی | •• |
| فرمان | : | بكە | مەكە | ( ە ) |

: ــ هاتە خويا كرن كۆ ( ٩ ) پەرچە كرن ب ( ٦ ) پەرچە تەڤگەر هاتنە •
: ــديسا كرن دوپەرچەيە : ١ ــپەندی ، ٢ ــنەپەندیيە•
: ــ بارام نان خوار ــ بارام نان خوارد
: ــ نان هات خوارن ــ نان خوراوە •••

: ــ هاته زانین کۆ ( کرۆك ) یاناڤه ، یا بەرناڤه :

ــ شێرۆ بارام بەردا
ــ وی بارام بەردا

: ــ هەروها پێکراو ژی : یاناڤه ، یا بەرناڤه :
ــ فەرهاد ( شێرکۆ ) کوشت
ــ فەرهاد ( ئەو ) کوشت

: ــ خــوه پێگرژی : یاجیدەمه ، ویا جیگــەه ، ( راکیشــو راکیشراوه ) :



## : ــ نێرو مێ دکرنێ دە : :

: ــ چاوا ژ رەوشو پەرگالا کرنێ هاته خویا کرن کۆ نێرومێ دکرنێ دە پەیدا نابن •
: ــ تەنێ دبەرناڤو ناڤێ نیشانداندە ، دتەکێ پەندیونەپەندی دە نێرو مێ هەنه • لێ ئەوژی دکرنا تێپەرا بۆری دە ولۆیه :

| | | |
|---|---|---|
| بەرناڤ | وی خــوار<br>وی خــواریه | وێــوار<br>وێ خــواریه |
| نیشاندان | ڤی خــوار<br>ڤی خــواریه | ڤێ خــوار<br>ڤێ خــواریه •• |

: ــ چاوا هاته خویا کرن کــۆ دپالڤــەدانێ دە ژبۆ نێرا ( ێ ) هاتیه ، وژبۆ مێیا ( آ ) هاتیه :

ــ خەنجرا من ، شوریّ من ...
ــ چێلەکا من ، گایّ من ...

: ــ چاواکو دتەکیّ ژماریّدە ( یەك ) ژبوّ نێرا ( ی )و ژبوّ میّیا ( ە ) جارنا تیّن :

ــ رەوشیّ ( ژنەکە ) باشە . ( ە )
ــ فەرهاد ( مێرەکي ) باشە . ( ی )



## ( ٣ ) ــ پەرچێ سیەم تیپە ــ ( الحرف ) :

: ــ تیپــئەوگۆتنەکۆ خوە سەر نکاري داخوازێبدیزانین•
ئەوژی دو پەرچەنە :

١ ــ تیپێ ڤیسین
٢ ــ تیپێ بداخواز

تیپێ ڤیسین تیپێ ئەبجەدی‌نە • ئەوژی دو پەرچەنە :

١ ــ تیپێ دەنگی
٢ ــ تپێ بێ دەنگ

: ــ دەنگی ژی دو پەرچەنە :

١ ــ دەنگ کورت
٢ ــ دەنگ درێژ

: ــ تیپێ ڤیسین ( ٣٣ ) سیەوسێ تیپن :

آ ، ب ، پ ، ت ، س ، ج چ ، ح ، ھ ، خ ، غ ، ف
ڤ ، ق ، ك ، گ ، د ، ز ، ر ، ش ، ژ ، ل ، م ، ن
و ، يێ ئە ؤ ، أ ۆ ، ئو ، ئێ ، ئي •

: ــ ژ ڤا تیپا ( ٨ ) بدەنگن : ــ آ ، ئۆ ، ئو ، ئێ ، ئي ، أ ، ؤ ، ئە

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دەنگ درێژ | ( آ ) ــ آدار ــ | آگر | ــ آدەم •• | |
| | ( ئۆ )ــ ئۆسمان ــ | ئۆردو | ــ ئۆب •• | |
| | ( ئو )ــ ئورس ــ | ئوسڤ | ــ ئوی | |
| | ( ئێ )ــ ئێ ڤار ــ | ئێرە | ــ ئێزیدی | |
| | ( ئێ )ــ ئيشەڤ ــ | ئيرۆ | ــ ئيران | |

| | | |
|---|---|---|
| دەنگ کورت | ( أ ) ـ أبراهیم ـ أسکەندەر ـ أسحاق •• | |
| | ( ؤ ) ـ کۆرد ـ کؤرت ـ کؤشت. | |
| | ( ئە ) ـ ئەگەر ـ ئەرزەن ـ ئەرتوش | |

: ـ ئەڤ تیپێ دەنگی تەڤگەرو آریکارن ژبۆ تیپێ بێدەنگ • چە دەما بخوازن گۆتنەکی چێکن ئەگەر تیپێ دەنگي تێ دە نەبن گۆتن پێك نابێ •

: ـ ( آدار ) • ئەگەر ( آ ـ آ ) ژناڤبەرا ( د ـ ر ) رابن دەڤێ مە لێ ناگەری ـ نکارن ژ دەڤێ خوە دەرخن ••

: ـ ( گۆشت ) • سێ تیپ بێ دەنگ بآلیکاریا تیپەك بدەنگ گهانەهەڤ • ( ۆ ) ژناڤ وان دەرکەڤي ( ك ، ش ، ت ، ) نابن گۆتن ئەم نکارن ژ دەڤێ خوە دەرخن •

: ـ تیپێ بێ دەنگ ئەونکو بێ آلیکاریا تیپێدەنگیدەنگژوان دەرناکەڤي ، ئەم نکارن ژدەڤێ خوە دەرخن ـ زمان لوان ناگەري• ژلەورا ئەم ژوارە دبێژن : تیپێ سادە

آورەك : ـئەگەر ژڤا تیپا پێڤە هن تیپێ دی هاتن مەیدانێ ژدەڤ خواریێە ، نەژ کۆکا تیپانە ـ نەژ تیپێ بنگەهینە • پشتی بلاڤ بونا خوەندن و هۆبون لناڤ ملەتو وەلێت ئەڤدەڤ خواري رادبي ، ژلەورا ئەم نکارن تو ناڤا ژوان خوارە تیپا رە سازبکن •

: ـ رستە هونان :

ئەی برادەر ! خوەش بزانە تیپێ کوردی ( ۳۳ ) سیەوسێ ( آ ) و (با) و (پا) و (تا)و (جیم)و ( چیم) و ـ دال و ـ سێ ـ (حێ)و (خێ)و (غین)و (ڤێ)و (هێ) و (ژێ )و ـ فێ ـو قاف ـ (زال)و(شین)و (رێ)و(لام)و (میم)و(نون)و ـ گاف ـو ـ کاف ـ (ئۆ)و (ئي) و( أ )و ( ئە ) و ( ؤ) و ( ئو )و ـ ئێ ـ و ـ یێ ـ ( وا ) نە • پشتی ڤا رە ئێ بێن خوارە شیوە گوە مەدێ •

## ( ٢ ) ـ پەرچێ دوەم تیپێ بداخوازن :

: ـ تیپێ بداخواز بخـوە ژ تیپێ ئەبجەدیٖ نە • لێ ژوان رە کارەك هاتیە دانین ـ داخوازەك ، یا چەند داخواز ژ هەریەکی ژوان تێ زانین • لێ چاوا دەرباس بویە :

ـ داخوازێ سەربخوە نکارن بدن خویا کرن •

## : ـ ئەوژی چەند پەرچەنە :

( ١ ) تیپێ دەستپێك : ( حروف الابتداء )

: ـ تیپێ دەستپێك ئەون کۆ دەستپێکرنا کارەك ددن زانین ـ ددن خویا کرن •

( لە ـ ل ) ـ دشیوەێ سۆرانيدە ، ۆ ل ناڤ ایلا ( مرداسـا ) ئەڤ ( تیپ ) ژبۆ دەستپێك هاتیە •

دبێژن : ـ فەرهاد لە کەرکوکوە دێ •

: ـ هێڤو ل ملاطیا هاتیـیە •••

( ژ ، ش ) ـ لناڤ کورمانجا ژبۆ دەستپێك هاتنە :

ـ روستەم ژ موشێ تێ

ـ ئەزدین ش زاخۆ تێ •••

( ز ) ـ ل جەم زازا بڤی داخوازێ تێ :

ـ بارام ز پالۆ هاتیە مال •••

ـ فەرهاد ز دیاربکر تێ •••

## ( ٢ ) ـ تیپێ تێ دە بون ـ ( ظرفیة )

( لە ل ) ـ ب هردو شیوا دبێژن

ـ بارام لە ژۆرە

ـ بارام ل هندرويه •
ـ بارام ل ژۆره
ـ بارام ل خواره
ـ بارام له خواره •••

: ـ جارنا بداخوازا ( سەر ) تێ :
ـ چوكا ل دارێ دانێيه ـ ل سەرداني‌يه •
ـ بەرف ل چيێ دباري ـ لسەر چيێ دباری •
ـ خوەلي لرەزێ مه كەتيه ـ لسەر رەزێمەكتيه•
ـ سێوێك له ژۆرێ داره •••
ـ كلاو له سەرێ شێرينه •••

( ب ـ به ) ـ بداخوازا تێده بون هاتنه • وەك :
ـ ب شەڤ ژ چولێ هاتم مال •
ـ فەرهاد به شەو و به رۆژ كار ئەكی •
( د ) ـ لجەم كورمانجا ژبۆ تێ ده بونه • وەك :
ـ شێرۆ دكۆ زكێده وەكه مێرا شەر دكي •
ـ دەسته گۆلەك ددەستی نەسرين دەيه •
ـ آڤ د آڤـاركی ده سارد بي •

: ـ وها رەنگه ئەڤ ( د ) نيشانا كرنا ناكايه چاوا كۆ دەرباس بويه : ـ دخوی ، دچ ي ••••
( ده ) ـ ئەڤ ( تيپ ) يا ( آلاڤ ) ژ بۆ چەند داخوازا هاتيه :

١ ـ ژبۆ بـجي كرنا داخوازا ( د ) هاتيه :

ـ دڤرده يه • دورده يه •••

٢ ـ ژبۆ غەيد هاتيه :

ـ ده بەسه ! ده بـخوه ! دەوەره •• •

## ( ٣ ) ـ تیپێ سوند ـ ( حروف القسم ) :

( ب ـ به ) ـ بەسەرێ باوکەم ئەم کردوە •

ـ به سەري پایغامبەر ئەم خواردوە •••

ـ ب سەرێ ته ئەم ولو کریه

ـ ب سەرێ پەیغامبەر ئەم خواریه •••

: ـ دکوردیدە ئەڤ تیپ بچەند داخوازا هاتیه :

١ ـ سوندە •••

٢ ـ آلیکاری : ـ ب خەنجەر بارام دژمن کوشت•
ـ بەخەنجەر بارام دژمني کوشت •

٣ ـ خوە پێڤە گرتن : ـ تۆز ب تەڤەیە •
ـ قەرێژ ب خەنجەرا تەڤەیە •

٤ ـ سەبۆنی : ـ ب نەخوەشیێ بارام مر •
ـ به ناخوشي بارام مرد •••

٥ ـ فەرمان : ـ • بکه • بخوە •••
ـ بیکە ، بێدە •••

٦ ـ تێ دەبون : ـ بارام ب شەڤ هات •
ـ فەرهاد به شەو هات •• •

٧ ـ بداخوازا ( ژێ)یه : ـ ب زێر شورێ خوە کلدایه •
ـ بەزیو شورێ خوی کلی دایه •

٨ ـ ڤێرەبون : ـ بارام ب خورشید ره هاتیه •

٩ ـ بداخوازا(ئەگەرە) : ـ ب آمن بي ئەم ناچن •
ـ بە قسەي من بي ئێمە نارۆن •

١٠ ـ بلندی : ـ شێرین ب سەر من دکەڤي •
ـ نەسرین بە سەر من ئەکەوی •

١١ ـ بداخوازا(آلي)يە : ـ ب آلي من دەهات •
ـ بە لاي من دەهات •

١٢ـبداخوازا ماندەلايە : ـ بێ خوە دی ـ بێ مال ••
ـ بێ کەس • بێ مرۆڤ ؟ ••



## ( ٤ ) ـ تیپێ فەرمان ـ ( حروف الامر ) :

( ب ) ـ ژبۆ فەرمانا بکرنێ هاتیە :

ـ بکە ، بدە ، بخوە ، بەردە ...

( مە ) ـ ژبۆ فەرمانا ب نەکرنێ هاتیە :

ـ مکە ، مەخوە ، مەدە ، مەبە ...

( نە ) ـ جارنا ژبۆ نەکرنێ تێ • وەکە :

ـ نەکە ، نەخوە ، نەدە ...

( با ـ بەلا ـ بەرا ) : ـ ئەڤ سێ آلاڤ ژبۆ ( هەری‌نا ) ، تینە گۆتن • وەك :

ـ بابخوی ، بانەخوی • بابکی ، بانەکی ...

ـ بەلا بخوی ، بەلا نەخوی • بەلا بکی ، بەلا نەکی ..

ـ بەرا بخوی ، بەرە نەخوی • بەرە بکی ، بەرەنەکی..

: ـ ئەم ژڤان رە دبێژن : ـ ( آلاڤ ) ژبەرکۆ بخوە دکەڤن بەریا تیپا • چاواکۆ هاتە خویا کرن : ـ بابخوی ـ بانەخوی ..

: ـ دڤردە ( با ) کتیە پێشیا ( ب ) ـ ( نە ) •

: ـ وەها رەنگە : ـ بەلا بخوی بەلا نەخوی : ـ بەرا بخوی ، بەرە نەخوی ...

دڤان هردوا دە ژی : ـ ( بەلا ـ بەرا ) کەتیە بەر یا ( ب ـ نە )•

: ـ چاوا دەرباس بویە جارنا فەرمان بێ آلاڤو تیپ ژی تێ وەك : ـ وەرە ، هەرە ، رابە ...



## ( ٥ ) ـ تیپێ بداخوازا ( ئەرێ ) ـ بمعنی ( نعم ) :

( آ ) ـ ژبۆ برسڤا پرسکرنا ب هەبونێ یە • وەك :
مرۆڤەك بێژی : ـ خورشید لماله ؟
دبەرسڤا وی دە تێ گۆتن : ـ ( آ ) • یانی بەلێ خورشـــید لماله • نەچویە دەرڤە •
: ـ دەما دو جار دبي ژبۆ ب جیکرنە • وەك :
آ آ خورشید لماله • یاني بجی لماله •
( ئە ) ـ ئەڤ ژی وەکە ( آ ) تێ گۆتن •
پرس : ـ خورشید لماله ؟
بەرسڤ : ( ئە ) • یاني بەلێ لماله •••
( ئێ ) ـ وەکە هەڤالێ خوە تێ گۆتن •
پرس : ـ خورشید لماله ؟
بەرسڤ : ـ ( ئێ ) • یاني بەلێ خورشید لماله •
: ـ چە دەما دوجار دبن وەکە ( آ آ ) ژبۆ بجيکرنە :
پرس : ـ خورشید لماله ؟
بەرسڤ : ـ ( ئەئە ) ـ یا ( ئێ ئێ ) لماله •
هەروەکو بێژی : ـ بەلێ بەلێ خورشید لماله •
( بەلێ ) ژبۆ هەرێ کرنا پرسێیە :
ـ جا چە پرسکرن ب (نا) بي ؟ یا ب هەرێ بي ؟ دبەرسڤاواندە تێ گۆتن : ـ ( بەلێ ) :

فەرهاد لماله ؟ ـ بەلێ لماله •
فەرهاد نە لماله ؟ ـ بەلێ لماله •

( با ) ـ بەرسڤا پرسکرنا ب ( نە ) تێ : ـ بارام نە لماله ؟

با ــ يانى بەلێ بارام لماله •
( ئەرێ ) ــ ژبۆ پرسكرنا ب ئەرێ تێ •     وەك :
پرس : ــ بارام لماله ؟
بەرسڤ : ــ ئەرێ •يانى بەلێ لماله •
( نا ) ــ ژ بۆ بەرسڤا پرسكرنا ب ئەرێ ونا تێ • وەك :
ــ شێركۆ لماله ؟ ــ فەرهاد نه لماله ؟
دبەرسڤا ڤا هەردو پرسادە تێ گۆتن :     ( نا ) •
: ــ لێ هەروەكو هاتيه زانين ( با ــ بەلێ ــ ئەرێ ــ نا ) ئەڤ چار ( آلاڤن ) نه تيپن •



## ( ٦ ) ــ تيپێ بداخوازا ( نا ) • ( حروف النفى )

: ــ ئەڤ ( تيپ ) ژبۆ ( ماندەلا ) هاتنه :

( نه ) ــ دكرنا بۆرى دە داخوازا پرسێ ددى ماندەلا :
پرس : ــ جەمشيد ل ماله ؟ جەمشيد چويه زاخو ؟
بەرسڤ : ــ جەمشيد نه لماله • ونه چويه زاخو •
: ــ هەروها دبێژن : ــ دلشا نان نەخواريه • نەچويه •••
( نا ) ــ داخوازا پرسكرنا ناكا وهێتێ ددى ماندەلا :

پرس : ــ وێ ئەزدين هەرى بازێر ؟
بەرسڤ : ــ ( نا ) • ئەزدين ناچي بازێر •••
( نۆ ) ــ آشيتا ل شونا ( نا ) دبێژن :ــ(نۆ) ئەزدين ناچيبازێر•

پرس : ــ شەنگۆ لماله ؟
بەرسڤ : ــ نۆ نه لماله •

( ن ) ــ وه‌كه : ــ نكارم ــ نزانم ــ ....

( هه ــ نج ) ــ دو خورده آلاڤن لشونا ( نا ) تێنه گۆتن :

ــ بارام لماله ؟ هه ــ یا نج . یاني نه لماله ...

( نه‌هن ــ نیه ــ نینه ــ تونه ) . چار آلاڤن دپاشــده تێنو بجاره‌ك داخوازێ ددن (مانده‌لا). هه‌روه‌كو دآلاڤاده ده‌رباس بونه: ( بێ ) . ئه‌ڤ ژی ده‌رباس بویه . بجاره‌ك په‌یڤێ ددیمانده‌لا.



## ( ٧ ) ــ تیپێ پێوه‌ند ــ ( حروف العطف ) :

تیپێ پێوه‌ند ئه‌ون كۆ بوان چه‌ند گۆتنا یا چه‌ند په‌یڤا بهه‌ڤره ولپه‌یڤ ددن گریدان و په‌رچێ پاشي دكن هه‌مكارێ ئێ پێشي .

( ئو ) :ــ
ــ زۆرو ستەم لمن دبارن .
ــ بارامو روستەم و ئه‌زدین هاتن مال .

دڤرده زۆرو ســتەم لپه‌ی هه‌ڤ هاتنه‌و د ( باراندنێ ) ده بونه هه‌مكارێ هه‌ڤ . وهاره‌نگه بارامو روســتەمو ئه‌زدین دهاتــن ده بونه هه‌مكار .

( وه ) ــ لناڤ سۆرا لشونا ( ئو ) تێ گۆتن :

ــ بارام وه ده‌روێش هاتن مال .
ــ شیرین وه نه‌سرین بحه‌طره بون .

( هەم ) ـ شێرین هەم ژیرو هەم جوانە •
( ژی ـ ش ) : ـ بارام ژی هات ـ بارامش هات •••
یاني وەکە هڤالێ خوە هات •••

: ـ روستەم هات بارام ژی هات •
: ـ فەرهاد چو شێرکۆ ژی چــو •
: ـ نەسرین هات شێرینش هات •••



## : ـ نیشان ـ العلامة :

( آ ) ـ دپالڤدانێ دە نیشانا مێیە :

ـ مەهینا من ـ مەهین ـ آ ـ من •
ـ خوشکامن ـ خوشك ـ آ ـ من •
ـ پشتا من ـ پشت ـ آ ـ من •

ـ جارنا دبي نیشانا ( کۆم ) :
ـ وا گۆتیە ـ وان گۆتیە •
ـ وا خواریە ـ وان خــواریە •

( ئێ ) ١ ـ دپالڤدانێ دە نیشانا نێرە :

ـ گایێ من ـ گا ـ ێ ـ من •
ـ کورێ من ـ کور ـ ێ ـ من •
ـ رمزێ من ـ رمز ـ ێ ـ من•

٢ ــ دنیشاندانێ ده دبي نیشانا مێ :

ــ ڤێ نان خواریه — وێ نان خواریه •

ــ ڤێ گۆتیه — وێ گۆتیه •

٣ ــ جارنا دبي نیشانا کۆم :

ــ بەرخێ مه هاتن — سەوالێ مه هاتن •

ــ بەرخ ــ ( ئێ ) مه هاتن ••••

( ئي ) ١ ــ دنیشاندانێ ده نیشانا نێره :

ــ وي گۆتیه • وي خواریه •••

( ئه ) ١ ــ نیشانا فەرمانه :

ــ بده ، بخوه ، بکه ، بمره •••

٢ ــ جارنا دژمارێ ده ژبۆ مێ یا تێ :

ــ یەکه دی وەرێنه • ــ مێ •

ــ یەکی دی وەرێنه • ــ نێر •

٣ ــ لجەم خلکی سلیمانيێ دپێش ( کرنا ) دومل ده لشونا ( د ) و ( دێ ) تێ گۆتن :

ــ ئەخوم ، ئەچم ، ئەیکەم •••

٤ ــ دهن جیاده ژبۆ بجیکرن تێ :

ــ وەی ؟ ئەڤ بارامه ؟

ــ ئەڤ شێرۆیه هاتیه ؟

( یه ) ١ ــ نیشانا کرنا دور بۆری یه :

ـ بارام هات ـ بارام هاتیه •
ـ فەرهاد خوار ـ فەرهاد خواریه •

٢ ـ دهن جیاده ژبۆ بجیکرنه :
ـ ئەڤ شێرۆیه ؟ ئەو رەوشنێیه ؟ •••
: ـ وا دیاره کو داویا گۆتنێ گرێدای بي ( ه ) دکەڤی داویا وێ
لێ کو داویا گۆتنێ تیپا دەنگیبي ( یه ) دکەڤێ داویا وێ :
ـ ئەڤ بارامه ـ ئەڤ فەرهاده ••
ـ ئەڤ شێرۆیه ـ ئەڤ رەوشنێیه •••

( دە ) ١ ـ لجەم خلکی هەولێرێ نیشانا کرنا دوملـ دودەمه :
ـ دەروا ، دەخوی ، دەچي •• •

٢ ـ دهن جیا ده خورده ( آلاڤه ) :
ـ دڤرده یه ، دورده یه •••

( د ) ١ ـ لجەم کورمانجا نیشانا کرنا ناکایه :
ـ دخوی ، دبي ، دکی ، دچی •••

٢ ـ جارنا نیشانا کۆمه :
ـ پەزێدمه هاتن ـ سوالێدا مه هاتن •••

( دێ ) ١ ـ لجەم کورمانجا نیشانا کرنا هێتنێیه :
ـ دێ بخوی ، دێ بدی ، دێ بچي •••

( وێ ) ١ ـ لجەم کورمانجا لشونا ( دێ ) تێ :
ـ وێ بخوی ، وێ بدی ، وێ بچي •••

( ئێ ) ١ ـ لجەم ( هەڤێرکا ) شونا دێ ـ وێ دگری :
ـ ئێ بخوی ، ئێ بچي ، ئێ بدی.•••

( وه ) ١ ـ لجهم سۆرا جارهك شونا ( ڤه ) دگری :
ـ خواردی‌یه‌وه ، گه‌رایه‌وه ...
٢ ـ جارهك شونا ( یه ) دستێني :
ـ خواردوه ، هاتووه ، رهوشتووه ...
( ڤه ) ١ ـ لجهم كورمانجا دپاش‌ده ژبۆ نیشاندانه :
ـ دڤر ( ڤه ) وهره ، دوی ( ڤه ) هه‌ره ...
٢ ـ دپێش‌ده ژبۆ ( ڤه‌گه‌ر )و ژبۆ خوارنا تشتی رۆنه :
ـ ڤه‌گرایه ... ، ڤه‌خواریه ...
٣ ـ لجهم بهه‌دینا جارنا ژبۆ ( ڤه‌گه‌ر ) دپاش ده تێ :
ـ هاتیه ڤه ، چویه ڤه ....
( ت ) ١ ـ لجهم بهه‌دینا جارنا ژبۆ ( كۆم ) تێ :
ـ گاێت مه ، بهرخێت مه ، ....
٢ ـ جارنا زێده تێ :
ـ دخوت ، دچت ، دبت ....
( آن ) ١ ـ نیشانا ( ژێده‌ره ) :
ـ گران ، بهردان ، لێدان ، رازان ...
٢ ـ نیشانا ( كۆمه ) :
ـ سواران ، مرۆڤان ، پیاوان ...
( ان ) ١ ـ نیشانا ژێده‌ره :
ـ خوارن ، كوشتن ، كردن ، بردن ...
٢ ـ نیشانا كۆمه :
ـ دچن ، دبن ، دكن ، ته‌رن ...
( ین ) ١ ـ نیشانا ژێده‌ره :
ـ زانین ، دانین ، هلانین ...
٢ ـ نیشانا كۆمه :
ـ دگرین ، فرین ، بهزین ، رهڤین ...

( ئون )۱ ــ نیشانا ژێدەره :

ــ خواربون ، پەڤچون ، سواربون ...

۲ ــ نیشانا کۆمه :

ــ سواربون ، پەیا بون ، چون .. .

( ئێن ) ۱ ــ نیشانا کۆمه :

ــ گاێن مه هاتن ، هەسپێن مه هاتن ...

: لێ دناڤ ده چه کرن لپەی کۆم بێ ، ئەڤ ( ن ) رادبي :

ــ گاێ مه هاتن ، کۆم .

ــ گاێ مه هات ، تەك .

( هات ) ــ کرنەکه آلیکار و هەم نیشانا کرنا نەپەندی‌یه :

ــ نان ( هات ) خوارن .

ــ بارام ( هات ) کوشتن ...

( تێ ) ــ نیشانا کرنا ناکا نەپەندی‌یه :

ــ نان تێ خوارن ، بارام تێ کوشتن :

( بێ ) ــ وەکه هڤالێ خوەیه ، لێ دکرنا هێتێ دەتێ :

ــ نان وێ ( بێ ) خوارن ، ماردێ ( بێ ) کوشتن ..

ــ خاني ئێ ( بێ ) لێکرن ...

( ره ) ــ لجەم کورمانجا ، خورده آلاڤەکه ژبۆ نیشاندان هاتیه.

بجیکرن ژی تێ ده هەیه :

ــ د ( رەواندز ) ره چوم بارزان .

ــ د ( خانەقین ) رمچوم ایران ....

( را ) ــ لجەم سۆرا نیشانا کرنا نەپەندی‌یه :

ــ مار کوژرا ، نان خورا ...

( رێ ) ــ لجەم سۆرا نیشانا کرنا دودەم نەپەندی‌یه :

ــ مار ئەکوژرێ ، نان ئەخورێ ...

★ ★ ★

# : ــ بەهەڤ گوهەڕاندنا تیپا :

( ئو ــ ۆ ) ــ لناڤ مرداسا ول دۆرا ( مەلەتیا ) لشونا ( ئو ) ، ( ۆ ) دخوینن و دبێژن : ــ ( ئەز ۆ بارام هاتن • )

( ج ــ د ) ــ لناڤ ئومەریاو ل دێرکا چیای مازی لشونا ( د ) ــ ج دبێژن : ــ ( جیا من ) لشونا دیامن •

( د ــ ت ) ــ لناڤ بەهدینا لشـــونا ( گاێد مە ) دبێژن : ــ گاێت مە •

ــ لسەر حەدا لشونا ( دەری ) دبێژن : ــ ( تەری ) •

( ج ــ گ ) کورمانج لشونا ( گەرگەر ) دبێژن : ( جەرجەر ) •

ــ بارام گۆر ــ بارام جۆر • یەزدی گورد ــ یەزدی جورد ••

( ع ــ ح ) لناڤ ( ئۆمەریا ) ل شونا ( علی ) (حەلی) دبێژن ــ و لشونا ( حەلیمێ ) عەلیمێ دبێژن •

( خ ــ غ ) ــ باغ ــ باخ ــ آغا ــ آخا ــ بخێری ــ بغێری•

( غ ــ ق ) ــ ل دەشتا خنوسێ ل شونا ( قالن ) ( خالن) دبێژن •

قەلەو ــ خەلەو • قومری ــ خومری •••

( ك ــ چ ) ــ لناڤ سۆرا ل شونا کێ گۆتیە ــ چێ گۆتوە ؟

ــ ژکیدە رێ تێ ؟ ــ لە چیندەرێ تێ ــ دێ •••

( ر ــ ل ) ــ ل دۆرا هەولێری ل شونا (گول ) ( گوز )دبێژن•

( س ــ ز ) ــ دەستگیران ــ دەزگیران • دەستگە ــ دەزگە •

( ش ــ ژ ) ــ ئەوژی ــ ئەویش • ژکوتێ ؟ ش کو تێ ؟ •••

( م ــ ڤ ) ــ سۆرا دبێژن : ــ ئەم ــ ئەمە •••

بەهدینا دبێژن ــ ئەڤ ــ ئەڤە •• •

( وە ــ ڤە ) ــ سۆرا دبێژن : ــ هاتە وە ــ گەراوە •

بەهدینا دبێژن : ــ هاتەڤە ــ گەراڤە •••

( ه ـ ح ) ـ هەسپێ من ـ حەسپێ من • هەمو ـ حەمو ...
( آ ـ ه ) ـ آسن ـ هاسن • آگر ـ هاگر ...
( چ ـ ش ) ـ بەچەنوی ـ بەشنوی • چو ـ شاند ...

●

## : ـ کێم کرنا تیپو آلاڤا

(د) کوردی هێلا سلیماني دبێژن ـ بەغا ـ ل شونا **بەغداد** •
ل شونا ( دخوم ) دبێژن ـ ئەخوم •
( دێ ) ـ هەڤێرکا ل ژۆری (نصێبین ) ل شونا ( دێ بخوم )
دبێژن ـ ئێخوم • آشیتا ل شـــونا ( دێ هــەرِی ) ( وێ )
هەری دبێژن •
( ب ) ـ هەڤێرکا ل شونا ( دێ بخوم ) دبێژن ـ ئێخوم •
ئێچم ـ ل شونا ( دی بچم ) دبێژن • هەروها ...

## : ـ زێدە کرنا تیپا •

( وە ـ ڤە ) ـ ئەڤ هەردو تیپ لناڤ سـۆراو بەهدینا زیدەنە •
ل شونا ( هات ) دبێژن : ـ هاتەوە ـ هاتەڤە • ئەگەر هەردوژی رابن
داخواز بجي دبي • لێ دهن ( کرنا ) دە گەرەکە بێنە گۆتن • **( گەر )**
ژبەرکۆ ژێرە دەرەك ـجیيەك نە ئەشـکرایە ، گەرەکە ( وە ـ ڤە )
بکەڤن بەر داکو بێتە زانین : گرانەوە ـ گرانەڤە ـ ڤەگرانە •
دڤردە ژێدەرێ سورێو بەهدینی وەکە هەڤ تێن لێ ژێـدەرێ
کورمانجی ماي برکا وا تێ :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سۆراني | ـ | گرانەوە | ـ | ژێدەر • |
| ... | ـ | گەرانەوە | ـ | کۆم • |
| بەهدینی | : ـ | گەرانەڤە | ـ | ژێدەر • |
| ... | ـ | گرانەڤە | ـ | کۆم • |

کورمانجی مای : ــ ڤگریان ــ کۆم •
••• ــ ڤه گه‌راندن ــ ژێده‌ر •

: لێ ل تاڤ به‌هدینا ژی گلك وه‌كه کورمانجا دبێژن •
( ئێ ) سۆرا زێده دکن و دبێژن : ــ ئێمه ــ ئێوه •• •
( ئه ) ــ سۆرا زێده دکن و دبێژن : ــئه‌من ــ ئه‌تو ــ ئه‌وان ••
( د ) ــ سۆرا ل پاشیا هن کرنا زێده دکن و دبێژن : ــ خوارم کردم ــ بردم ــ مردم ــ سارده •••

وێ چاخێ ژێده‌رێ سۆری دبي : ــ خواردن ــ کردن •••
لێ ژێده‌رێ کورمانجی دبي : ــ خوارن ــ کرن ــ •••
( ت ) به‌هدینا و سۆرا ل داویا هن ( کرنا ) زێده دبێژن :

دچیت ــ دخوت ــ دکت ــ ئه‌روات ــ ئه‌چێت •••
به‌لام ژێده‌رێ به‌هدینا ــ چوین ــ خوارن ــ کرن ــ تێ •
لێ ژێده‌رێ سۆرا : ــ رۆشتن ــ خواردن تێ •••
: ــ ئه‌ڤ ( ت ) دکوردستانا ( مه‌رکه‌زی ) ده : به‌هدینا ــهه‌کاریا ــ تایری‌یا ــ بۆتا گلك خویا دکي • لێ چاوا مه‌گۆتیه دکرنێ ده‌هه‌یه به‌لام د ژێده‌ر ده په‌یدا نابي • ژله‌ورا ئه‌ز دبێژم زیده‌یه ــ نه ژکوکا گۆتی‌یه •

داوی